شیعر

# بەرەو شێت بوون

عومەر سەیدە

٢٠٠٥

* بەرەو شێت بوون

* عومەر سەیدە

* شیعر

* نەخشەسازیو بەرگ: هونەر وەهبی

* ژمارەی سپاردنی(١٥٥)ی پێدراوە لە هەولێر

* تیراژ: ( ٥٠٠)

* لە بلاوكراوەكانی لقی كەركوكی یەكێتی نووسەرانی كورد ـ ژمارە(٥)

# مەرسیلیاکانی مەرگ



ئەستێرەیەک

بەر لەوەی فێری درەوشانەوە بێت
وسڵی بێدەنگیەکانی
بەتاریکی شەوێکی نووتەک دەرئەکرد
شەویش کەتەمەنی دەگەیشت بەویقار
دارستان جگەرەیەکی
بەسپێرە کپ و مەنگەکەی پێدەکرد...
ئیدی حەشاماتێک جریوەو
جیهانێک خوڕەو
بەشی دوو گوێ گمەی دەخستەوە...
خۆر لەنێوەندی مانگ و زەوی

تەختەیەکی بۆ(بالیا)ی چرکەکان چێدەکرد
لەنێوەندی گیا و شەونما
پانتاییەکی بۆ ماچ بەخشی...
ڕۆژباش ئەی نەسیمی سوبحەدەم
ڕۆژباش ئەی باوێشکە تەمگرتووەکان
بنوارن...! دارتێلەکانی شار
وەکو جاران کۆترەکێوی جورئەت ناکا
لێی هەڵنیشێ
بنوارن...! لەسیمام
وەکو جاران جورئەت ناکەم
ڕەنگێ بدەم بەنیگاکانم
بژنەون... (سەدا)م
وەکو جاران جورئەت ناکەم
گۆرانیەکی رووتتان بۆ بڵێم...
زوبانم بووە بەمیوانێکی شەرمنی ماڵی دەمم
چاوم بووە بەپەنجەرە بۆیەکراوەکان و
هەناسەنیگایەکی تەڕنادات
دەچمە بەردەم ئاوێنەکەم و
کەسێکی تر دەبینم...
کەسێکی بێناسنامە و... بێ وڵات
بێ مەعشوق و... بێ دڵ...



هەست رادەگرم ..
گوێم لەترپەی دڵ و چرپەی هەناسەم نیە
لەجەللادێکی تەواو پەشیمان دەچم
بەرماڵەکەم ئەرشیف کردووەو
لەبەرکردنی ئایەتەکانی سوورەتی(قاف)م
لەچوار چێوەیەک ناوەو نایرۆژمەوە
بەئاوی خاتیراتی هەرزەییم رووم دەشووم و
بەشی ماچێکی تەڕ .. نەرم نابمەوە...
لەخەونێکی ئاوارە دەچێ ئەمڕۆم
بۆ دەربازبوون بەرەو سبەینێ
بیر لەخەوێکی قەترانی قوڵتر دەکەمەوە
رووناکی ژوورەکەم خامۆش دەکەم و
پێدەکەنی و.. پێدەبێتەوە
تەنها لە ورتەیەکی تێدەگەم
کە دەڵێ: رابە... دەبەنگ...
جارێکی دی دەکەومەوە موتاڵای
رۆمانی(خۆکوشتنی بەردە جوانەکە)و
دەگەمەوە فاتیحای
دوایین پیری تازێباری ئێوارەکان و
قاوەی ماچێك بۆ بەختی لێوەکانم دەگرمەوە...
بۆنی سەرابێکی شین دەکەم

که له من روونتره وێنەکەی
لەجەنگەوە هاتووەو ماندووە
دەمگاتێ و دەمم پێوە دەنێ و
نیو تنۆک درۆم لێ دەخواتەوە ..
بەهەر دوو مشت دەکێشێ بەتەوێڵما و
بە خوڕ دەگریی‌ی‌ی...
بیرمە دوێ شەو
قەسیرەیەک نەنووستبوو
بڕیاریدا کەسێک بنووسێت لە من بچێت
چیرۆکێک بەدەم وڕێنەوە
وێنای زیندانێکی بێ دیوارو بێ دەرگای دەکرد
کت ومت لەحەوشەی دڵم دەچوو
رۆمانێک روئیا نەفرینەکانی
توڕدایە ناو زەمیلەی دەستی کچە ئەهریمەنێکەوەو
بە خاشاکی کەللەسەری منی دەچوواند...
بالیفەکەم ..
ئای بالیفە دەستبڕاوەکەم
بەستەزمانی... کە وادەزانی هەر وەکو شەوانی پێشوو
تەنها تۆ دەگرمە ئامێز
نا... نامەی پەتووم پێگەیشتووەو
ژوانێکی لێل و تەڵفترم هەیە ئەمشەو..



دیسانەوە دەچمەوە سەر جەللاد و
لە هاوکێشەی خێڵ و کوتەک
ئەزو جوانیم کەڕەتی درۆ دەکەم
هیچ راستیەک بە تەرازووی خۆم ناکێشم
هەر خۆم و...خۆم لا سەنگینە
من نازانم... من زەویم راگرتووە لەسەر دەستمە
یان زەوی منی بەکۆڵی ماندووی دەگێڕێ
هێند دەزانم ..
دایک و باوکم... مردوون و زیندوون
پەنجەو چاوم... نووستوون و دەنووسن
گوێم لە(تی ڤی)یەکەیە و هێڵنجی
سروودی ئازادی دەداتەوە
بەحەیرانی خەبات ئینتەلای کردووەو
بە درامای دیموکراتی تای لێهاتووە...
هێشتا هەر کاڵ نەبووەتەوە لەبەرچاوم
ئەو قەنارەیەی
من و ئەو ملمان دایێ بۆ سەرکەوتن
تا هەنوکە .. لێوم بەستە بۆ دۆڕانەکانم دەڵێت...
تابلۆی سەما شووشەییەکانم نووشتایەوە
تا سووژدەیەک بۆ عاشق بوون و
دوعایەک بۆ تەریق بوونەوە بخوێنم

کۆپیەک لەسەدای گوڵێکی پەژمووردە
لەچاوی پەپولە دڵڕەنجاوەکاندا بە جێماو
دەبێ بەهار خەجاڵەتی ئەم واوەیلایە بکێشێ
دەبێ پاییز رووڕەشی ئەم ئافاتە بگرێتە ئەستۆ...
وەرزەکان تابلۆی
ئەم جەنگە بێژووەیان کێشا
تا ساڵ بدرێت بەپاڵەوانترین
وەرزی ساڵ
تا ماڵ بدرێت بەجەللادترین
جەللادی ماڵ
ئێوە... ئەی وەرزەکان
ئەو دێڕەتان بۆ سڕییەوە
کە ئێمە نووسیمان:
(ئێوەمان خۆش دەوێت)
وێنەکانتان لەچوار چێوەی چاومان دەنا
بەڵام ئێستا هێندەی
ئەو درنجانەی خەونەکانتان زڕ دەکەن
دوژمنتانین
هێندەی دیکتاتۆرە دۆڕاوەکان
دوژمنتانین
هێندەی سوپا نەگریسەکانی جەهل



دوژمنتانین...
باش دەزانین...ئێوەش ئەی وەرزە شوومەکان
ئێمەتان بەژیانەوە ناوێ
ئێمە دڵمان لەئینجانەی گوڵێکی ئاوی هەڵدەگرین
ئێمە دەزمان لەبۆکسێکی تۆز لێنیشتوو ئەرشیف دەکەین
ئێمە.. ئێوەش وەکو رەشنووسی شیعرەکان
لەبیر دەکەین
ئێوەو ئێمە لە ناوەڕاستی یەئسا دەخولێینەوە
ئێمەو ئێوە درۆ بۆ هەموو جیهان دەکەین ..
لە جەنجاڵی دارستانەوە ..
بۆ شلۆقی بازاڕ
لە بێدەنگی کانیەکەوە ..
بۆ تەنیایی ژوورە چۆڵەکان
فەتوای ئارامی بەگوێی دونیادا دەدەین
ئارام ..ئارام وەکو ئەو سێبەرەی
لە تەنیایی خاوەنەکەی سڵ دەکاتەوە
ئارام .. ئارام وەکو ئەو سنەوبەرەی
کە نازانێ بۆ کێ هاتووەتە سەما
ئارام... ئارام...
لە کەناری روبارێکەوە
بۆ قولایی ئۆقیانووس لە یەک دەچین

دەمێک ئارەزووی پەڕگیری و
دەمێک سەرمەستی مەلەیەکی سەرمەدین
ئای .. ئەو دەمانە .. چەند کاڵفامین
وادەزانین لە دڵتەنگی پەپولەیەکی
چاو بەفرمێسکی دەم پایز تێدەگەین
کاڵفامین .. کاڵفام
گەر وابزانین بۆ گوڵە وەریوەکان
هەڵاڵەمان پێیە
بۆ سنەوبەرەکانیش شنەیەکی نەرم ..
دەبێ بۆ دواجار
لەگەڵ هەورا پیاسەیەک بخوازین
باسی ئەو مانگە بکەین
کە لەشەوێکی زستانا چاوشارکێ لەگەڵ دەریا دەکا
باسی گوناهی ئەستێرەیەکی رەجمکراو بکەین
باسی گوڵێکی بێ ئاو و ..
نەمامێکی بێ سێبەر بکەین
باسیان بکەین... باس...
ئاستەمە بتوانین لەخشپەی ئەو گەلایە حاڵی بین
کە بەر لەخەزان... بەنا بەدڵی سەمای هەڵوەرین دەکات
لەو نەورەسەی کە مەعشوقەکەی پڕ وەفایەو دەتۆرێ
لەو ئاسکەی راوچی دیار نیە و تیرێک دەدا لە دڵی خۆی



ئاستەمە .. ئێمە لە گێلێتی خۆمان بگەین
ئاستەمە ئێمە و ئەوان بینەوە بە دۆست
بینەوە بە هاوسایە ..
بینەوە بەبرا ..
برایەتی . .رێک تەریبە لەگەڵ ناحەزی
برایەتی .. دیوی دووەمی نیفاقە
دیوی سێیەمی فێڵە و
دیوی چوارەمی تەڵەکەبازییە ..
ئای برایەتی تۆ هەر لە هابیل و قابیلەوە
ناشیرین بووی تا ئێستا
ئیدی با شتێکی دیکە بین .. برا .. نا
با بچینەوە ژێر دەوارەکانی زاهیدی و
تەهلیلەی ئاشتی بۆ ئەڵقەی جودایی بڵێینەوە
بۆ ئاوابوونی جوانیمان ئاوێنەیەک
بانگهێشتی دڵتەنگیمان بکەین
باقامچییەکان فرێدەین و
تەوقەکان بشکێنین ..
گورزەکانمان لەگۆڕنێین
بۆ زەمەنی زیندووبوونەوەی فیرعەونەکانی جەهالەت و
ئیمپراتۆرەکانی بە بەندە کردنی فریشتە...
با خودامان خۆش بوێت... هەروەکو چۆن

ئەو بەندە نەگریسەکانیشی خۆش دەوێ
یا لە سەمای دەرویشێک حاڵی بین
کە پرچەکەی بەپەریشانیەوە شاباشی دەفەکان دەکات
یا تێرنەخۆین تا هەتایە .. لە ماچی ئەو کچەی
هەمیشە بەلێوێکی تەڕەوە
فێرمان دەکات .. بیینەوە بەمرۆڤ
فێرمان دەکات بگەڕێینەوە
بۆ چاخی بە ئاوریشم کردنەوەی دڵ
بۆ دەمی دەم بردنەوە بۆ دەم ..
یا بڕۆینەوە بۆ گەلەری
دیمەنەکانی عەدەمیەتی خۆمان
یا لەوێندەرەوە
ئیعترافنامەی بەرائەت بنووسینەوە
بڵێین ئێمە بووین ..
هەمووشتێکمان دۆڕان
ئێمە بووین ..
درۆمان بەدەم خواوە کرد
ئێمە بووین ئایەتەکانمان پێچەوانە تەفسیر کرد
ئێمە بووین...
ئاتەشگەی زەردەشتمان خامۆش کرد
ئێمە بووین...



لەخۆشمان بێ ئاگا بووین ..
یا بیینەوە بەو پنتە ڕەنگەی
لەگۆشەی تابلۆیەکی ئەسیرا
(سروودی پێکەوەمردن) دەچڕێ
یا ئەو مشتە گوللەیە پەشیمان بکەینەوە
کە سنگی هەموومانی کرد بەسەرەن ..
ئەمجارەیان لە بازاڕی عیشقێکی تاهیرا
دڵمان بە ماچێ بفرۆشین
پرسەی ڕاستیەکانمان لە دۆزەخ بگێڕین
لە تەنیشت پەپولەکانی سەلمانەوە ..
لەتەنیشت ..فریشتەکانی شەنافیە و حەیدەرییە و عەرعەرەوە ..
زەماوەندی درۆکانمان لەبەهەشت بشێوێنین
بە حەیرانی رووحی بەفرینی دایکانەوە ..
سەمای تەریق بوونەوەیەکی زەرد بکەین...
ڕۆژووی بێ ئاگاییمان
بە هەڵمی ئەو روبارە خوێنانە نەرم بکەینەوە
کە لەمەلۆتکەی ساوایەک و
لە فەقاینەی کچێکی نەشمیلانە و
لە جامانەی پیرێکی کۆست کەوتووەوە
نەخشەی نیشتمانێکی دزراویان دەکێشا...
خوایە من چی لە وەتەن بکەم یا هەر ئاوابێ

با هەر دڵگیر و شیرین بێ
با هەر خاکی وەکو گەوهەر بێ
با هەر ئاوی وەکو کەوسەر بێ
کە نەتوانم بەهاران ڕێگەی ماڵی گوڵ
بە پەپولە ئاشنا بکەم ..
کە نەتوانم ئەدرەسی ئاشتی
بدەمە کۆترێکی سپی ..
کە نەتوانم بەپاچی حەزی کۆرپەی شەهیدێک
ئەم درەختی شەڕە لە ڕەگەوە دەربهێنم
ئەم تاعونی نیفاقە لە فەرهەنگی مرۆڤەکان بسووتێنم ..
ئەی ڕەقیب چی لە قەومی کورد بکەم کە هەر ماوە
تۆ گرەو دەبەیتەوەو
ئەوەتا وێنەکەت سەرەو خوار هەر لە جێی خۆیدا هەڵواسراوە
ئەو دانەری تۆپی زەمانەش شاهیدە
کە کەس نامانشکێنێ خۆمان نەبێ
ئەم ئافاتە لە هەر چوار پەلی نیشتمانماندا نووسراوە ..
هیوا... هیوا
لە ناو دڵمان سەفەری کردووە
ئێستا لەناو لولەی چەکەکانماندا تاساوە ..
لە کام بازرگانی جەنگی بکڕینەوە
چۆن لەگەڵ دەستە گوڵێکدا



بینێرین بۆ سەر گڵکۆی خەونە پاکیزەکانمان...
ئەو پڵنگانەی هەردی ولاتم
ئێستا دێوجامەکان
وەکو سوێسکە ڕاویان دەکەن
زەمانێک بوو ڕایانرەشەکاند ئالا بە دەستی خاراویان
ئەمێستا هەناوی یەکتر دەکەن بە خوێن
بە هەستی ناپاراویان
سڵاوی گەرمی دڵی پڕ یەئسی ئێمەتان لێ بێت
سڵاوی گریانی تاساوی کوڕ و کچی
ئەم نیشتمانەتان لێبێت
سڵاوی مامەپیرەی چاو کزی پەنا دیواری مزگەوتەکانتان لێبێت
سڵاوی توڕەبوونی نێرگز و داربەڕووتان لێبێت...
ئەوەتاین لەقەندیلی سەربەرزەوە
نازانین سڵاو بۆ کێ بنێرینەوە
ئەم شەهیدبوونەمان گیلێتیە
گەرچی هەتا ئێستاش زیندووین
دایکان شیوەنێک بپۆشن بەباڵامان
دایکان بۆمان بکەن ڕۆ... ڕۆ

ئایاری ٢٠٠٤

# دوایین جەنگی
# سەرکردەیەکی دۆڕاو



ئارەزووی دۆڕانمە لەم جەنگەش
لەوەتەی هەم ... سەرکردەیەکی بەزیوم
دەرگای هەموو سەرکەوتنەکان کلۆم دەدەم
نەبادا ئەم جەنگەم نەدۆڕێنم
هەموو جارێ سەر شۆڕانە لە شەڕگەکان هەڵدەهاتم
هەر بۆیە جەنگەکانم بوونە ناسنامەی دۆڕانی من
سەرەتا سەربازێکی ساویلکە بووم
خودەی سەرم چۆلەکەکان لێیان دەرفاندم
پۆستاڵەکانم مێروولەکان لێیان دەشاردەوە
لە مێژە من ئاشنای سەنگەر و شەڕگەمە
هەموو چیا و هەڵدێرەکان .. هەموو ڕێگاو بیابانەکان
من دەناسن چ قارەمانێکی بێ هونەرو چ شەڕخوازێکی ترسنۆکم
دوایین شەڕمە ...بشێ ئەم جارە سەرکەوم

ئیعلانی جەنگم کرد ئەم جارەش
بۆقەکان دایان لە قاقای پێکەنین
چونکە دەزانن شەوان لە دەنگی وان زۆر دەترسم
دوایین شەوبوو ... دوایین پێکم بە خۆشی جەنگەوە فڕکرد
دوایین ماچ بوو ... سۆزانییەکەی لای چەپمەوە
بە تینەوە لە لێوەکانمی وەرگرت
دوایین یادگارییە ... یا دەبێ بیم بە سەر کردەیەکی قارەمان
یا بیمەوە بە سەر بازە ترسنۆکەکەی جاران
دوایین وتەم لە نێو هۆڵی کۆڕە مەخمەلیەکەدا پێشکەش کرد
(ئاشکرایە تەمەنێکە من و جەنگ عاشقی یەکرین
من عاشقی جەنگێکی بێ ئافات و
جەنگ عاشقی مێلکی هەمیشە دۆڕاو)
دوایین خەوی نێو پێخەوی دڵنیایی .. چاوم لێک نا
تەماشام کرد
ئاسمان ڕەش بووە و زەوی ڕەش
وولاَت یەک پارچە گوڵی ڕەش بوو بە جاری
لە پێشوازی سەرکردە جەنگ خوازەکەیان
دەست لەسەر سنگ هەموو ژن و پیاوی وولاَتەکەم لە چاوەڕوانیدا بوون
سەر بەرز، دڵ پڕ بزە، چاو ڕوو لە ئاسۆ دەڕۆیشتم
لە هاوشانم دەستەیەک لە پاسەوانە جەربەزەکانم ڕێیان بۆ چۆڵ دەکردم
ئیمپراتۆر لە سەر دەستی من ڕوخا



جیهان هەمووی ، بە خوێن و بە ڕۆح لەگەڵما بوون
بۆ سەر کەوتنە کەم وێنە کەم
دام لە قاقای پێکەنین فەخر بکەم بە سەر کەوتنەوە
وەخەبەر هاتمەوە و ڕابووم ..
خۆم پڕ چەک کرد ئەمجارەش
وەکو جاران هەنگاوەکانم پەشیمانیان لێ نیشتبوو
جەنگی من
عیشقی سەدای شەقژنی باڵی هەورە
عیشقی قولنگیی پۆلە مەلەکانی پاییزە
عیشقی ئاوازی پرسەدارترین ڕەشە(با) یە
عیشقی ئاوێزان بوونی فریشتەکانە
زایەڵەی گومان ناخی کردووم بە خەرابستان
ئەم جارەیان شەو دەکوژم ... هەتا ڕۆژ ئارام بگرم
خۆر دەکوژم ... هەتا مانگ شووم پێ بکات
بۆ شکاندنی شووشەی شەرمی ئەم شەڕە .. زیقێکی زۆر ووردم
بۆ ترازاندنی دوگمەی ئەم سینەیە ... پەنجەکانم هەڵفڕیون
کۆتر نیم و نامەی ئاشتی بهێنم
ئاسمان نیم و شینێکی کاڵ بنوێنم
لە مێژە من سەنگەرم گرتووە لە عیشق
ئەمجارەیان یا دەبم بە شای عیشقستان
یان وا هەڵدێم ئیدی کەسێک شوێن پێیەکانم هەڵنەگرێت

زەنگی گومڕایی وەک هەڵۆیەکی سەر لێ شێواو لەو سەری تەنیاییمەوە دەزریکێنێ
کەشتی ئەم شێتییەم لە کەناری مەرگ نەبێت لەنگەر ناگرێت
بەر لەوەی دوایین فوو ... بکرێت بە کەڕەناکەوە
نیگام مەیی و خەیاڵم چووە حزوری
ئەو ئینجانەیەی شەقایقی ماچێکی خاڵی لە فێلێ گرتووە
ئەو ئاسمانەی ئەستێرەی عیشقێکی خاڵی لە دووڕلی تیایە
ئەو (شارێ)یەی ڕێبواری خۆشەویستیەکی خاڵی لە درۆی تیایە
کەڕەنا لێدراو بانگێک بوو لەمەرگەوە
مەرگ دیاری تەریب بوونی شەڕە لەگەڵ ئاشتی ..
ڕەمزی سەرکەوتن لەتەوێلما کەوتە خوار
ڕەنگم هەر زەرد دەچووەوە
غەریزەکانم جارێک بە منداڵێکی لاسار دەیانچواندم و
جارێک بە سەر بازێکی سەرلێ شێواو
لەگەڵ ئەوەی پێشم دەڵێن سەر کردە ..
پەپولە بۆ ماچی گوڵ هات
(با)ی سەبا تورِی داو وونی کرد لە جوانی
مانگ بۆ ئاوێزان بوونی دەریا هەڵهات
شەپۆل شێتانە لێی تێک دان
منیش گەرەکمە ئەم جارە کچی (شا) بڕفێنم
هەزار و یەک شەوە پیلان دەگێڕم
هەزار و یەک شەوە ئاخ هەڵدەکێشم



هەزار و یەک شەوە نامە دەنووسم
قەدیسی مەعبەدەکانی واهیمەش فەتوای لە خاچ دانم دەدەن
ڕاهیبە داوێن پیسەکانی تەقەللام لنگیان هەڵبڕیوە و گەرەکیانە فڕێوم دەن
ئای چەند حەزێکی خورافیيە هەڵوەدای بوومە
چەند شێتیەکی جوانە ئەم دەسبردنە بۆ (ئەو)ی حەرام لەمن
منی زەندیق, منی ئەهریمەن, منی حەزیا
لەفەرهەنگی هیچ جەنگێکدا نەبووە
ئاقاری (من) لێژێتەوە بۆ نزیک ئاقاری (ئەو)
(ئەو)ی زەنبەق,( ئەو)ی پەریسا, (ئەو)ی جوان
بەلأم هەر دەجەنگم هەتا ئەمجارەش دەدۆڕێم و
کاسکێتەکەم فڕێ دەدەم و دەستم لە توێی کەمەر بەندەکەم دەنێم و
بەسەری کاسەوە دەگەڕێمەوە
نا.. نا ئەمجارە ناگەڕێمەوە هەتا خۆری مەحاڵ
زەنگۆڵ .. زەنگۆڵ ئارەقەی یەئسم پڕێ نەچۆڕێنێ ناگەڕێمەوە
هەتا پەلی ئەمیرە نەگرم ونەیهێنمەوە ..ناگەڕێمەوە
دوایین بڕیارە ... دوایین شێتیە
بووکی دەریا دەبەین بۆ حەزیای ئەشکەوت
فریشتەی خۆشەویستی دەبەین بۆ ئەهریمەنی چیا
دوایین جەنگە ... ئیدی داوای ئاشتی دەکەم
هاوڕێم بیرتە؟ شەوەکانی من سەمفۆنیای ڕۆژەکانی (ئەو)ی تیابوو
شەوەکانی من .. ڕۆژەکانی (ئەو)

دوایین رۆژە ... هەروەک ڕۆژانی دی چاوی پەشیمانیم شۆڕە
لە نێو ئاپۆرای حەزە حاجیلەییەکانمدا
گوێم لە شەقژنی باڵی مەلە تەریکەکانی شەهوەت و ئارەزوومە
لە خۆمدا گوێم لە هەزاران ئاوازی خۆشەویستیەو
لە خۆشەویستیما خۆم بەدی دەکەم بە کوژراوی
جوێ لەم شەڕەم سەدان شەڕی دیکەم دۆڕان بە خەیاڵی بێ هودەیی
جوێ لەم عیشقەم هەزاران حەزی دیکەم بوون بە قوربانی گەمژەیی
من کفری عیشقم کرد
بۆیە خاچی غرور درا لە باڵام
ئاسمان کفری  فراوانی کرد
بۆیە حەشری ئەستێرەکانی تیا هەستا
(ئەو)یش کفری جوانی کرد
بۆیە سەدان نیگا لە هەنگاوە شەپۆل ئاساکانیدا خنکان
ئێمە دروست بووین ژیان بناسین؟
یا چاوەڕوانی دوایین ژوانی مەرگ بکەین
من لە وردە شەپۆلی (کانی)  حەزەکانی دایک و باوکمەوە هەڵقولام
کەچی ئێستا ئۆقیانوسێکم لە خەم ..
(ئەو) تەنها بە پەنجە یاقوتیەکانی سلاوی لەمن دەکردو
منیش بە هەموو جەستە و ڕۆح و هۆشمەوە بۆی بە چۆکدا دەهاتم
سبەی نامۆتر لەنامۆکانی ئەم شارە
سەری کاسی تەنیایی خۆی لەسەر ئەژنۆی پەشیمانی دەنێت ..



من تازە ئەم جەنگەش دەدۆڕێنم
وەلێ (ئەو) لە تەهلیلەی غرورە کەم نەفەسەکەیدا
زیکری تابلۆی عیشقم لە میحرابی خەمەکانیا دادەنێت
لە پایزی نازو گریشمەی (ئەو)دا
دڵم کردە پەرژینێک لەسۆز و باڵا گەردانی باڵایم کرد
(ئەو) مۆمێکی خامۆش بوو منی پەروانە دامگیرساند
(ئەو) کلوە بەفرێکی نەباریو بوو
منی چیا ئامێزم بۆ گرتەوە
سبەی هەر وەک ڕۆژانی دی بێخەم هەتاکو زەردە پەڕ
بیر لەجوانی ڕووخساری خۆی دەکاتەوە
دوایین سۆزێتی ..
وشە بریندارەکان وەک چیرۆکی دەم گوێ ئاگردان دەخوێنێتەوە
فوارەی ئەشکی خۆشەویستیم بەبارانی شێتی ناوزەد دەکات
زەلیلیشم لەو قەفەسی موحیبەتە بە گەوجێتی لەقەڵەم دەدات
من دەزانم ئەو دەمانەی
(ئەو)ی مەریەم خیانەتی لە نیگاکانی خۆی دەکرد
(مەسیح) ێکی بێنەوای لەبار خۆی دەبرد
(ئەو) دەزانێت
چارۆکەی کەشتی شێتیم هەڵداوەو
ئەمشەو دورترین ئەستێرە روگەمە
شەوێکی دیکە نەورەسی حەزم دەتۆرێو

بەسەر شەپۆلی هیچ ماچێکدا
خولی نەشئە هێن لێنادات
من نەفەسی دوایین جەنگم زۆر درێژە
چاوم لە ئاسۆی سەرکەوتن بڕیوەو
وەک چەتەیەکی دەریا
نەخشەی خەزێنەکەم لە گیرفانی سەر دڵم هەڵگرتووە
دوایین تەلیسمی کردنەوەی دەرگای ئەشکەوتی نزیک بونەوە دەخوێنم
تا کلیلی خەزێنەی ئەم خۆشەویستیە دەربهێنم
دوایین نامەم بەهەزار و یەک وشە تەواو کرد
دوایین بەختم .. شووشەیەکی داخراوەو خستمە دەریاوە
دوایین نزامە .. یا سەرکەوتن یا مردن
دوایین هەزمە .. ئەم جەنگی عیشقە .. ئەم عیشقی جەنگە
دوایین هەنگاومە .. ئەمیرەم دی و نامەکەشم دایە دەستی
دوایین هەواڵە .. چاوەڕوانی سەرکەوتنم هیچ هەواڵێک نەگەڕایەوە
دوایین عیشقە .. پڕە لە بێهوودەیی
دوایین جەنگە .. خۆشم نازانم کە دۆڕام یا سەرکەوتم

شوباتی ٢٠٠٢

# عیشقێک لە ماڵی دڵمە



عیشقێک لە ماڵی دڵمە
عیشقێک دڵم دەکات بە بەرد
عیشقێک لەگەڵ خۆیدا پیرم دەکات
عیشقێک لێم ناگەڕێت بنووم
عیشقێک هەموو شەوێ دەمڕفێنێ
دەمبا بەرەو دوورگەی رۆئیا
رۆئیای خاڵی بوونەوە لە حەز
حەزی ژیان چەند چرکەیەک
ژیان لە مەملەکەتێکی هیچدا
مەملەکەتێک لە وڵاتێکی هیچتردا
وڵاتێک پڕ پڕ لە ژان

ولاتێک پڕ پڕ لە خوێنی ڕژاو
ولاتێک پڕ پڕ لە منداڵی بەجێماو
دەزانم حیکمەتی مردنی دایکم
قەدەری گوێنەگرتن بوو لەم وانە بێتامەی من
من نازانم خۆشم بنوسمەوە
کەچی شەوان گوێ ڕادەدێرم بۆ دەنگی پێی
ئەسپی سروشە ونبووەکان
سروشە بێ ئەدرەسەکان
ئەو سروشانەی خاڵین لە فەنتازیا
ئاوادەبەم و غروبیشم سەرنجڕاکێش نییە
هەڵدێرم و..
نە کوکوختیەک
نە پاسارییەک
بۆ سپێدەی من ناخوێنن
سپێدەی من وەکی سپێدەی وان نییە
جیهانی من وەکی جیهانی وان نییە
ژیانێک لە ماڵی دڵمە
ژیانێک دڵم دەکات بە ئاو
ژیانێک لەگەڵ خۆیدا وانەی گریانم فێر دەکات
ژیانێک لێم ناگەڕێت بمرم
ژیانێک هەموو شەوێ دەمرفێنێ



دەمبا بەرەو کیشوەری بوون
بوونی پڕبوونەوە لەحەز
حەزی مردن چەند چرکەیەک
مردن لە ئاسمانێکی پڕ هیچ
ئاسمانێک لە گەردوونێکی پڕ هیچتر
ئاسمانێک پڕپڕ ورشە
ئاسمانێک پڕپڕ لە ئەستێرەی کشاو
ئاسمانێک پڕپڕ لە بورجی بە جێماو
ژیانی من وەکی ژیانی ئەو نییە
ژیانی ئەو جوان و گەورەیە
هێندەی جوانی و گەورەیی سەرچاوەی بوون
ژیانی من ناشیرین و بچوکە
هێندەی ناشیرینی و بچوکی شەمشەمەیەکی سۆزانی
ژیانی من دەمخنکێنێ و چۆڕێک سۆزم دەرخوارد نادات
ژیانەکان هەمویان جوانن
ژیانێک ئێمە تیای دەژین و نەفرەتی لێدەکەین
ژیانێک لە ئێمەدا دەژی و ستایشی دەکەین
ئەستێرەیەک لەگەڵ کشانی خۆیدا باڵێکی نارد بۆ شیعرێکم
کەچی لە هەموو فڕینەکانیدا تەنها زەوی لێدیارە
فڕینێک نیوەی بۆ زەوی و نیوەی بۆ ئاسمان
دواجار هەر دەبوو لەسەر بەردەکانی باوەنوور هەڵنیشێتەوە

تا لەگەڵ پەپولەکانی ئەویندەر حەشر بکرێت
شیعرێک خەمم دەنوسێتەوە
خەمێک لە ماڵی دڵمە
خەمێک دڵم دەکات بە شەو .. و دەمنوێنێ
خەمێک لەگەڵ خۆیدا پەستم دەکات
خەمێک لێ ناگەڕێت پێبکەنم
خەمێک هەموو شەوێ دەمڕفێنێ
دەمبا بەرەو ئۆقیانوسی عەدەم
عەدەمی پەرتبوونەوەی حەز
حەزی نیوەگیانی چەند چرکەیەک
نیوەگیانی لە دەلاقەی هەورێکی پەرێشان
دەلاقەی هەورێک لە هەوایەکی پەرێشانتر
دەلاقەی هەورێک پڕپڕ بروسکە
دەلاقەی هەورێک پڕپڕ لە بارانی ڕژاو
دەلاقەی هەورێک پڕپڕ لە کڕێوەی بە جێماو
چ عیشقێکە ئەم ژیانە پڕخەمەی لا جوان کردوین وەک بەهەشت
بەهەشتێک هەیە و نایبینین
بەهەشتێک هەیە و ناماندەنێ
بەهەشتێک هەیە و نایگەینێ
ئای..بەهەشت دەبێ لە تۆدا شوێنەکانی ئێمە چۆڵ نەبێت
چ خەمێکە ئەم ژیانە پڕ عیشقەی لا ناشیرین کردووین وەک دۆزەخ



دۆزەخێک هەیە و دەیبینین
دۆزەخێک هەیە و دەماندەنێ
دۆزەخێک هەیە و دەیگەینێ
ئای دۆزەخ دەبێ لە تۆدا ئێمە بە زیادە نەهاتبین
چ ژیانێکە ئەم عیشقە پڕ خەمەی لاسادە کردوین وەک شوێنی ئالی ئەعراف
شوێنێک هەیە و دەیبینین و نایبینین
شوێنێک هەیە و دەماندەنێ و ناماندەنێ
شوێنێک هەیە و دەیگەینێ و نایگەینێ
ئای.. شوێنەکەی ئالی ئەعراف
دەبێ لە تۆدا ڕامانگرن بۆ هەڵمژینی نەسیمە جوان و ناشیرینەکان

٢٠٠٣-٢-٢٤/٢٣

# بمبەرەوە



بمبەرەوە ژێر هەورەکانی بەهار و
ئاشنام بکە بە دوایین گریانی ئاسمان
دەرەمبێنەوە لە بوون و
ڕێگەکانی عەدەمم پێ نیشان بدە
ئەی تۆ کە لە ژیان و مردنما هەر تۆیت و
منیش هەر تۆ
بۆ نایەیتەوە جەنگەڵەکانی مرۆڤ بوون و
جارێکی دی نەخشەی بوون بکێشیتەوە
تۆ دوایین پەری باریوی ئاسمانیت و
منیش یەکەمین بەندەی پڕ گوناه
دەڕۆیت و بێ ئاگا لە هەموو منەکانی ئێرە
دەڕۆیت و بێ خەم
لە هەموو بەدمەستەکانی هەرێمی عیشق و
هەموو ئەهریمەنەکانی چاخی شەڕ



بانگهێشتی تەفرەدان دەکەیت
دێیتەوەو تیلاوەتی ئایەتەکانی خاکی بوون لە بیر دەکەیت
لە نێوەندی من و تۆدا
بەرزەخێک هەیە لە درۆ
دەریایەک هەیە لە پەرستن
کێوێک هەیە لە کەللەسەر
جەستەیەک هەیە بەر خەنجەر دراو ..
تۆ ئەی یەکەمین و دوایین شەقامی نووستوو
من کە ڕێبوارێکی نابەڵەد بم
گرنگ نیە لە تۆوە تێپەڕم یان
لە شەقامە سۆزانیەکانی ئەم وڵاتە
شێتیە مردن لێرە .. هەر وەکو چۆن
گەمژەییە ژیان ..
دەڕۆیت و وون دەبین لە چاوانتدا و
بۆ گەلە شێتێکی وەک ئێمە دەگەڕێی
دەمریت و بێ ئاگا لە هەناسەدان دەژێیتەوە
دەڕۆیت و تەریقی دەتهێنێتەوە بەردەم
یەکەمین حەرفەکانی من
کە بۆ ڕوگەکانی عیشقم ووتن

٢٣-٢٤/١٠/٢٠٠٤

# ئاسمان



وەرە ئەی ئاسمانە نابەڵەدەکەی من
مەگەر وەرزی باران نیە
دەڕۆیت و ناتەوێ لێرە داکەی
من ساڵەهایە چاوەڕوانی بارانێکم ..
من لە نێوەندی خۆم و تۆدا
ڕەنگە ئەمشەو قەسیدەیەک بنووسمەوە ..
ئەی ئاسمانە نابەڵەدەکەی من
ئەی پڕ ستارەترین ئاسمان و
ئەی بێ ماناترین داتای عیشق ..
ئەمێستا من رووتم .. رووت
رووتم و چاوەڕوانی رووتبوونەوەی تۆم
رووتم و چاوەڕوانی تۆم

داماڵییت لە ئەستێرە ڕەدوو کەوتووەکان ..
چەتریکم ناوێ
پێرەچی خولیای پەتایەکم بێت
کە لە عیشق بچێت ..
من بێزار بووم لەم هەورە نەزۆکانە
ئیدی لە دووی قورەلیتەی
ئەو ماچانە دەگەڕێم
کە بەشی ئەم تەمەنە ناشیرینە
نەشتەیان پێیە بۆمان ..
هێی ئاسمانە نابەڵەدەکەی من
وەرە وەکو من ڕووت بەرەوە لە دونیا
ڕووت بەرەوە لە خۆت و درۆکانت ..
روت بەرەوە لە فێڵ و مەکرەکانت
ڕووت بەرەوە و
دەمێکی دیکە بۆ وون بوونی من بگەڕێ
بزانە لە تەنیشت کام مەیفرۆشەوە
خەوی بێ تۆیی بردوومی بۆ کەنارەکانی مەستی
بزانە کام دەریام مارە کردووە
دەمەوێ جوت بین تا نزیکی ئۆرگازمەکانی مەرگ ..
ئەی ئاسمانە نابەڵەدەکەی من
شێت بە بۆ شێت بوونم



بگری بۆ گریانم
ئەمێستا من شێتێکم بێ هۆش
ئەمێستا من شیوەنی دووری تۆمەوە
لە پەلکە زێڕینەی هیچ بەهارێکدا
ڕەنگەکانی تۆ نادۆزمەوە
لە پێرەشتی هیچ گەرمیاتێکدا
نابمەوە بە سەرابی حەزەکانی تۆ ..
ئەی ئاسمانە نابەڵەدەکەی من
شین دەکەیتەوە گوایە لە ئاسمانی خەڵکی دەچی
نا .. تۆ هەموو شیناییەکانی تابلۆی تەمەنمت دەرهێناوەو
ئیدی من بۆ هیچ شیناییەک ناگەڕێم ..
ئیفتیخار دەکەی بە درەوشانەوەکانت و
وا دەزانی بەشی هەموو درۆکانت ورشەی ئەستێرەت هەیە ..
هەقە پێ بزانی
کە ئەو مانگەی
ڕووناکیەکت دەداتێ بۆ ڕێگاکانت
ئەوە نەفامی وشەکانی منە
دەبنە گوڵەئەستێرەو مانگ فێرە تریفە دەکەن
هەقە بگری بۆ گریانەکانی من
چونکە من لەگەڵ گریانەکانی تۆدا فێرە عیشق بووم ..
ئەی ئاسمانە نزمەکەی من

بگەڕێوە ئێستا دەمی قسەکانی من و تۆیە
بگەڕێوە ئێستا دەمی ڕەدوو کەوتن نیە
بگەڕێوە ئەی ئاسمانە بێشەرمەکەی من ..
من پایزان ڕووت دەبمەوە بۆ وەرینی گەڵاکان و
تۆ بۆ شیوەنەکانی من ئاوڕێکیش نادەیتەوە ..
ئەی ئاسمانە ژەنگرتووەکەی من
دەڕۆیت و دڕاوی ئەم ماچانە
لە هیچ هاوکێشەیەکدا پاساو نادەیتەوە
ئیدی من چۆن لەم تاقی کردنەوەیەتدا دەربچم ..
ئەی ئاسمانە لێڵەکەی عیشقم
پێم بڵێ: کەی ڕۆژی وەفا دەگەڕێتەوە
کەی وەرزی خەندە سەرێکی ئەم هەرێمە دەداتەوە ..
کەی من و تۆ دەمێکی دی دەچینەوە (کانی عاشقان) و
پاش ڕۆژباشێکی دیکە
نامەیەکی دیکە دەگۆڕینەوە ..
کەی وێنەیەکی دیکە پێکەوە دەگرین بۆ یادگار ..
کەی شەڕە تۆپەڵێکی دیکە دەکەین ..
کەی من وتۆ جارێکی دیکە
ماچەکانمان لە زەرفدا دەنێرین بۆ یەکدی ..
ئەی ئاسمانە تەمگرتووەکەی من
خۆ من نازانم ڕوو لە کوێ بکەم



تا نوێژەکانی عیشقم دابەستم
من نازانم کام بەهارەیە تۆی بۆ ڕۆیشتووی ..
زەنگی بکەرەوە من چاوەڕوانی
دوایین وشەی دەنگی تۆم ..
ئەی ئاسمانە سەر هەڵگرتووەکەی من
هیچ شازادەیەک ئاشنای خوانی لەگەڵ تۆ بوون نیە
من نەبێ ..
هیچ زەمینێك تینووی بارانەکانی تۆ نیە
بیابانی من نەبێ ..
هیچ لێوێك وشکی ماچەکانی تۆ نیە
لێوی نەبێ ..
بگەڕێوە ..
گەر گەڕانەوەش گرانە
من دێم و لە مابەینی دێڕەکانی ئەم قەسیدە مەستەمدا
پەنهانت دەکەم بۆ تا هەتایە ..
بگەڕێوە ئەی ئاسمانە دڵتەنگەکەم

٢٢-٢٣/٩/٢٠٠٤

# تەمەنێک پڕ لە خەتا



ئەمەیە ژیان
دێین و دەڕۆین و نازانین بۆ
دەژین و دەمرین و نازانین بۆ
شەوان لەگەڵ تەمی کۆڵانە سارد و تەزیوەکاندا
پیاسە دەکەین تاوەکو بەختەوەری بدۆزینەوە
لە زاهیریدا هێندەی نەماوە کاڵ بێتەوە دڵمان
کەچی هەر بە زەنریقمان ناو دەبەن
ئێمە سرودمان نەدەزانی
باوکمان فێری چیرۆکی جەنگی دەکردین
فێری کردین چۆن حەزمان لە شەڕ بێت
فێری کردین چۆن یەکدی بکوژین
فێری کردین چۆن داستانی شەڕانگێزی بخولقێنین
ئێمە سۆزمان نەدەزانی

دایکمان فێری گریانی ووشکی دەکردین
فێری کردین چۆن حەزمان لە ماچ بێت
فێری کردین چۆن یەکریمان خۆشمان بوویت
فێری کردین چۆن حەزمان لە مردن بێت بۆ خاتری ژیانی ئەوانی دیکە
لە بارینی بەفرە سپیەکانەوە فێری ساردبوونەوە بووین
لە بارینی بارانە جوانەکانەوە فێری پاک بوونەوە بووین
لە وەرینی گەلا زەردەکانەوە فێری خەمینی بووین
لە شکوفتنی وەنەوشەکانەوە فێری عیشق بووین
ئەمەیە ژیان
من بەدیار فەشەلی خۆمەوە قاوە بۆ بەختی مەعشوقەکەم دەگرمەوە
بە بەرامەی سەماکانم شەونمە نەشئە دەپرژێنمە سەر
تاڵە هەودای پرچی پەپولەکان
لەگەڵ هەناسەی هەنگێکدا دەچمە دیبەنی هەلالەیەک
باسی شیرینی عیشقی بۆ دەکەم
لەگەڵ دەزولەی تیشکی مۆمێکدا
زیارەتێکی ماڵی حەزی پەروانە دەکەم
چیرۆکی چێژی سوتانی بۆ دەگێڕمەوە
لەگەڵ نەسیمێکی دەریا سەفەری تۆرانی نەورەسێک دەکەم
لەسەر پەڕەی شەپۆلە توند ڕەوەکان
نۆڤلێتی ماچی مەعشوقەکەی بۆ دەخوێنمەوە
ئەمە بوو ژیان
هەمیشە دەمانەوێ زیاتر فێربین



فێربین چۆن درۆ لەگەڵ خۆمان بکەین
چۆن ماڵی خۆمان وون بکەین
چۆن حەزمان لە ماچ نەمێنێ
چۆن ژیان بناسین
ئێوارەیەک ئاسمان بڕیاریدا
دیاری بوێنێت بۆ عاشقەکان
گریوەی داکرد بەسەریاندا
ئەوانیش وەک برینداریکی وێڵی هەتوان
بەرەو پیری دەڕۆیشتن
ئاخ ژیان
من زۆر جار دەمەوێ وەکو شێتەکان
بتوانم هەموو شتێ بکەم لە ژێر ئاسمانا
بەلام(بۆ هەر کوێ دەڕۆم ئاسمان هەر شینە)
چارەکە سەدەیەکە تەمەنێکی پڕ لە خەتام بەسەر برد
خەتای ئەوەی کە بێ خەتام
زەمەنێکە من دەگریم
دەگریم بۆ ئەو شتانەی کە پێکەنینم پێی دەهات ..
بەهەموو تەمەنم هەر دەڕۆم
دەڕۆم بۆ لای ئەو کەسەی کە نامەوێ ببینم
لەگەڵ بادا پیاسەیەک چوومە دارستان
لەگەڵ گوڵدا زیارەتێ چوومە ئێنجانە
لەگەڵ حەزدا سەفەرێ چوومە ئاوێزان

لەگەڵ ماچدا چرکەیەک چوومە نەشئە
باو دارستان .. ئینجانەو گوڵ
حەزو ئاوێزان .. ماچ و نەشئە
فێریان کردم
کە هەمیشە تورەبم
تورە لەوەی بۆ گەورە بووم .. !!
با لەمنداڵیدا کۆلارەکەی جوانتر دەفڕاندم
دارستان لە منداڵیدا پەناگە بوو بۆ چاوشارکێ
ئینجانە لە منداڵیدا هەموو رۆژێ گوڵی بۆ دەگرتم
حەز لە منداڵیدا بۆ زۆر شت بوو
ئاوێزان لە منداڵیدا لەگەڵ هەموو کەس بوو
ماچ لە منداڵیدا شیرینترین تامی هەبوو
نەشئە لە منداڵیدا فێری کردم کە زۆر شتم خۆشبوێت
بەڵام ئێستا هەمویان بێهوودەن ..
ئای خۆشەویستی چ زوو ناشیرین بوو
وێنەکەیم هەر لەبەر چاوە
رۆژی دە جار نەفرەتی لێدەکەم ئێستا
شەوێک بینیم دارسێوێک هەناری گرتبوو
هەنجیرێک .. قۆخ
ئاسمانێک دارستان و زەمینێک ئەستێرە
دەریایەک بڵێسە و ئاگرێک شەپۆل
منێک رەشەباو شاخێک روئیا



تەرزەیەک قاسیدی ژووانێک بوو
بارانێک شۆردینێوە
ئێمەش لەگەڵ هەر تنۆکێکی باراندا
ماچێکمان شاباشی ژیان دەکرد ..
نامانەوێت بمرین
رۆژێک مامانێک دێت و دەمانکوژی
نەمانویست لەدایک بین
فریشتەی رۆحکێش هات و فرێیدراینە ئەم ژیانەوە
ئەمە بوو ژیان
نەمانتوانی لە هیچ بگەین
تەفسیری تەواوی یەک نیگامان لەبەر نیە
کەچی بۆ هەموو تەماشاکان پێناسەیەک دادەنێین
لە پرۆژەی بەبەرد کردنی دڵمان هەرەسمان هێنا
خەریکی بەئاو کردنی حەزەکانمانین
خۆ دەشێت بەردێک سۆزی تیا پەنهان بێت
ئاوێکیش دڵڕەقی

١٨-١٩/١/٢٠٠٣

# ماچەکانی شازادە



گوێم لە چرپەی حزوری رۆحتە
گوێم لە تریقانەوە بێدەنگەکانتە
هەست بە پەنجەکانت دەکەم لەسەر دڵم
دەتبینم و ناتبینم ..
بۆنی هەناسەکانت دێ و
دەمباتەوە بۆ ئەو شەوەی
تۆ خەریکی چنینی پۆزەوانە بووی بۆ من و
منیش دەترسام لەو شەهید بوونەی
کە ئیدی تیایدا ناتوانم هەموو رۆژێ
پەنجەکانی دەستی راستت رامووسم ..
بێ چپە فەرشی لێوەکانت رادەخست
بۆ تەشریفی ماچە ئاگرینەکانی من

ئەو (بۆیە)یەی سەر پەنجەکانیشتم لە خەیاڵە
کە لە ڕەنگی پانتایی ئەو زەمینە دەچێ منی تیا شەهید دەبم
گمەی کوترێک دێت
کە بەشی دوو گوێ دەکات
گوێی ڕاستی من و
گوێی چەپی تۆ
لە یادمە گوێی چەپی من و گوێی ڕاستی تۆ
پێکڕا نووسابوون و
باسی ئەو ڕۆژەیان دەکرد
کە ئیدی ناتوانین گوێمان
لە تەنها یەک حەرفی یەکدی بێت
ئەو حەرفانەی
کە منی دەکرد بە پاڵەوانێکی ترسنۆک و
تۆی دەکرد بەو بووکەی
لە ئاهەنگی بووکێنیەوە ڕەدوو کەوتبێ
ڕەنگی ئەو بەستە گوڵەم لە چاومدا پاراستووە
کە من و تۆ لە پشتیەوە
خۆمان لە هەموو ڕەقیبان شاردەوە
چ نەورۆزێکی بێ گوڵ بوو ئەو بەهارە
دەمێک دەبمە ئەو کوڕە وەرزێرەی
کە بۆ کارەکەری



هاتبوومە ناو داڵان و دەهلیزەکانی
کۆشکی باوکە پاشاکەوت و
هەموو نیگا بێ گوناهەکانم
دەناردنە بەر دەرگای ژوورەکەی تۆ
لە کونی دەرگاکەتەوە لێم دەڕوانیت و
یاساوڵەکانی جەهل
پەلیان دەگرتم و بەرەو سێدارەکانی
پێکەنینی تۆیان دەبردم
دەهاتی و بە ماچێک یاساوڵەکانت مەست دەکرد و
منیشت دەکردە قەزاوەتی پینەکانی کراسەکەم ..
شمشاڵێکم دەژەنی لەسەر بەردێک
دوور لە ئاوایی و
هەموو مەلەکانی باخچە دەهاتنە سەماو
تۆش چوون شازادە دڵبەرەکانی
چاخی عەدەمیەتی سۆز
فووت دەکردە کەڕەنای عیشقەوەو
بە پەنجە ئاوریشمینەکانت
ئیمزای پیاوەتی منت دەکرد
تاجەکەی پاشات بۆ من دەهێنا و
خۆت دەکردە کەنیزەکانی دیوەخانی پاشاو
دوایین سەمای تێکئالانت لەگەڵ دەکردم

دەبوومە شوێن پێی شەونمی سەرگەڵایەک و
لەناو لەپتا دەتوامەوە
قا .. قات لێدەدا بە رووتیم و
پەشیمانت دەکردمەوە لە ماچەکان
بە پشتی دەستی چەپم لێوەکانم دەسڕییەوەو
بە پێشی دەستی راستم رووتی خۆمم دەشاردەوە
دەگریام بەبێ دەنگی ..
خۆمم وەک زیندانیەکی بێ ئیختیار دەهاتە بەرچاو و
تەمەننای پەتی سێدارەکانم دەکرد

٢٠٠٤/٨/١٣

# پایز



پایزەو هیچ گەڵایەک حەوسەڵەی وەرینی نیە
بارانێک سەرنادا ..
ڕەشەبایەک هەڵناکات ..
بە بێرەنگی دەڕوانمە ئاسمان و
هیچ گەواڵە هەورێک بەدی ناکەم ..
دەچمە بەردەم ئاوێنەکەو
خۆم دەدەمە بەر نیگا و
شتێک ناڵێم .. تا شتێکی دیکە فێر بم
لە شێتێک دەچم
پەشیمان بێت لە شێتی خۆی
دەگەڕێمەوە ناودڵانەکان و
پیاسەیەکی ناوەخت دەستپێدەکەم

له جەنەڕاڵێکی تەواو دۆڕاو دەچم
تفێک دەکەم و دوو جنێو
له ژیان بە ژیان ..
دەڕۆمەوە ناو ژوورەکەم و
پەردەکان دائەدەمەوە
نە خەوێک .. نە خەیاڵێکی جوان نایەنە لام
ها لە پڕ خەوێک بردمی و
سپێرە رادەبم .. شەقام پڕ جوڵەیەو
من .. نا
گوێم لە بەیانی باشە
بە زەردەخەنەوە ..
ورتەیەکم لێوە دێ و خۆشم نازانم چی دەڵێم ..
لەسەر کورسیەک دادەنیشم و
بیر دەکەمەوە لە هیچ
بیر دەکەمەوە لە هەموو هیچەکان و
لە خۆم و خۆشی و خۆزگە .. نا
شووشە بەتاڵەکان بۆن دەکەم و
پەرداخەکان دەشکێنم
جگەرەیەک پێدەکەم و
کچێک دەڵێت: خنکام
دەچمە ناو باخچەکەو



تەماشای گوڵە خنکاوەکان دەکەم
تەماشای چیمەنە خەواڵوەکە دەکەم
من دەبم بە چیمەنەکەو
کەسێکی دیکە .. وەکو خۆم
پیاسەم بەسەردا دەکات ..
پاییزەو هێشتا ئەو باخچەیە
هەندێ گوڵی ماوە بۆ وەرین
گوێم بە دەنگی زیکری شەوان دەزرنگێتەوەو
درەنگ .. زۆر درەنگ دەکەومە وتنەوەی تەراتیلەکان
درەنگ .. زۆر درەنگتر
تەسبیحات دەست پێدەکەم
درەنگ .. زۆر زۆر درەنگ
نوێژەکانم ئەدا دەکەم
قیبلەنماکەم وون کردووەو .. خۆریش
ئاسمانم وون کردووەو .. زەویش
خۆمم وون کردووەو .. یاریش
پاییزەو هیچ سیمایەکی خەزان دیار نیە
هەوسەڵەی پیاسەی ئێوارانی بازاڕو
شەوانی دەرەوەی شارو
بەیانیانی باخی گشتیم نەماوە
نە دەنگی کوکوختیەک سەرەنجم رادەکێشێ و

نە جریوەی پاسارییەک بێزارم دەکاو
نە سەمای سنەوبەرێک دەمهەژێنێ
بێزارم و .. بێزارییم لێدەچۆڕێ
نە گوێم لە مزگەوتێکە بانگی ژیانەوە بدات و
نە زەنگی کڵێسایەک لەم مەرگە
رامدەچڵەکێنێ ..
دەمەوێ هەڵبێم قاچەکانم نایەن لە دووم
دەمەوێ دانیشم کورسیەک نابینم
دەڕۆم .. هێواش .. هێواش
جادە چۆڵ و سێبەر بوو دەڵێم ..
ئەڕۆیشتم خەیاڵاوی ئەمڕوانی
لە پڕ سەرم هەڵنەبڕی و
هیچیشم نەبینی بەرامبەرم دەرکەوێت .. هیچ شتێک
گەیشتمە نزیک چنارەکان و
گەڵایەک بۆ دڵتەنگی من وەری و
شەماڵێک بۆ ماچی گەڵاکە هات و
خشپەیەک ووتی: (پایز)ە

٢٠٠٤/١٠/٢٩

# سەمای دەستمان



پەنجەم بارانی لێدەباری
لەو دەمەوەی
دەستەکانت لەناو دەستما بوون بەهەور
ئەو چرکانەی چۆلەکەی نیگاکانی تۆ
لە کانیلەی چاوەکانما مەلەی دەکرد
پۆلە ماچی تەڕم دەدی
بەرقەوە بۆم دەهاتن
دە لێگەڕێ .. لەو ڕقانە و
وەرەو هەرچی منم بیبە بۆ خۆت
تەنها سێ پەنجەم بەرەوە
تا شیعرێکی شەرمن بچڕم
شەرمن .. وەکو هەنسکە بێدەگەکانت

بیرت نەچێ ئەمجارەیان
دەستەسڕەکە فڕێبدە
تا پەنجە تاساوەکانم تێر.. تێر
لەروباری دەستەکانتا ئاوی شەرم بخۆنەوە
ئای دڵی من .. چەند قینم لەو دەستەسڕەیە
کە نەیدەهێشت
هەموو خانەکانی پەنجەم
ماچی هێڵەکانی ناو لەپت کەن
دەوەرەوە من تا ئێستاش چاوەڕێتم
شەوێکی دی بێیتەوە لام
بەنەسیمی هەناسە عەنبەرییەکەت
جارێکی دی بموەرێنی لەم درەختی ئازارانە ..
ماچێکی دی بنێرە بۆم لەزەرفێکا
تا نامەیەکی ئاڵترت بۆ بهۆنمەوە ..
بمخۆرەوە لەپێکێکداو
باسی شەوەکانی بێ من بکە
باسی مێزو کورسیە خاڵیەکان بکە و
پەرداخەکان بشکێنەوە
بە بەدمەستی مستێکی دیم پیا بکێشە و
لەخەوی بێ تۆیی بێدارم کەرەوە ..
کە رۆیشتیەوە ئەمجارەیان بیرت نەچێت



پەنجەکانت لەسەر مێزەکەم وون نەکەی
من بێ پشوو
چاوەڕوانی نامە ئاوییەکانت دەکەم

٢٠٠٤/٥/٣

# بەرەو شێت بوون



پیاسەیەک لەگەڵ دواهەمین قومی جگەرەکەمدا
گەیشتمە بۆنی
هەناسە ساردو خەم لێ نیشتووەکانی یار
پێڵاوەکانم لە پێی کردم و
پیاسەیەک لەگەڵ حەزەکانمدا
گەیشتە بەردەم
پەیکەری بەردینی دڵی یار
پێنووسەکەم هەڵیگرتم و
پیاسەیەک لەگەڵ سرووشدا
گەیشتە قەسیدەی شێت بوون لە داخی یار
بالیفەکەم سەری خستە سەر سەرم و
پیاسەیەک لەگەڵ خەودا
گەیشتە زەماوەندی بووکێنی یار

سەفەرێک بە من چووە غوربەت و
گەیشتە نزیک کەژاوەی شەوی هەنگوینی یار
ئەی یار
ئەی حەزرەتی بەرد
بڕیار بوو ئەم زستانە
جانتایەک تۆ بکاتە شانی و
بە دیاریت بوێنێ بۆم
بڕیار بوو
نامەیەک بتنووسێتەوەو
زوبانی ماچ و گوڵینی خۆی لە تۆدا بپژێ بۆم
بڕیار بوو
من و ژووان لە تۆیەکدا کۆببینەوەو
من و ماچ تۆی یەکتری بکەین و
من و دەست تۆ بکەینە ناو دەستی یەک
من و گۆرانی تۆی عیشق بچڕین
من و ئەڵقە تۆ بگۆڕینەوە
من و شەو تۆ پێکەوە بخەوین
من و ئامێز تۆ بە یەکدا بکەین
بڕیار بوو
تۆو شیعر گوێ لە من بگرن
تۆو دڵبەردی بین بە ئاو



تۆو ئاگر خامۆش بین
تۆو خۆشەویستی ئاشت بینەوە
تۆو عیشق بین بە خوشک
تۆو سێبەری دار توو بێنە ژوان
تۆو پەپولە من ئاسا ماچی یەکتر بکەن
تۆو پاساری تەماشای فڕینی من بکەن
تۆو گۆرانی گوێ بۆ منی عیشق رادێرن
بڕیار بوو .. بڕیار
گوڵ دەستەیەک تۆی سوور بوێنێ لەگەڵ خۆیدا
شیعر باوەشێک منی تەڕ
ماچ جانتایەکی چکۆلانە بۆ ئەرشیف کردنی تۆ
مۆمێک عیشق بۆ لە دایک بوونی من و تۆ داگیرسێنێ
حەیفی نە گوڵ هات و
نە شیعر هات و
نەماچ هات و .. نە مۆم
ژووان هات و من خاڵی بووم
مێزێک و دوو کورسی و دوو پەرداخ هاتن و
من و تۆ نەهاتین
پاییز بە خشپەی یەکەمین گەڵای زەردی
ختووکەی رۆحی دێت
هەر وەکو چۆن نامەی ئەو بە یەکەمین من

خەریک بوو رۆحی دەرچێت
بزە منی مەرگی گرتووەو
سەما منی ئازار دەکات
مەرگ بۆنی من دەکات
ئای .. لە مەرگی عاشق
چەند گوناهە بەم پیریە
عیشق خەریکە دیگەیەنێ بە من
گوێم لە ئینجیلی عیشق بووەو
تەفسیری دڵرەقیم لەبەرە
تەئویلی فرمێسک دەقاو دەق دەزانم
خاچ درا لە من
بۆیە ئێستا خەریکە لە مل دەکرێم
دواهەمین جگەرە
دایگیرساندم و
گڵۆپی ژوورەکەم ماندووەو دەیەوێ بخەوێت و
تاقەتی نیە چاوی من بکوژێنێتەوە
دەرگای ژوورەکەم سەرمایەتی و
تاقەتی نیە من داببخات
خامەکەم لە پەنجەرەی چاوی منەوە
ناو ژوورەکەی یار دەبینێ
لێوەی دیارە



بە خەیاڵی قوڵی خەوێک سەفەری کردوە
لەسەر لێفەکە لاچووەو
سنگی لێفە سپی دەکاتەوەو
پرچی وەک پەتی سێدارە ئاڵاوە
لە ملی یار
پێنووسەکەم فزوڵیە
خەریکە دواهەمین ئەو دەخوێنێتەوە
کە نامە بۆ منی نووسیوە
بەبێ سڵاو
ناتبەخشم
گەرچی درەنگ منی نووسی نامە بۆ تۆ
بیر کردنەوە تاقەتی منی نەما بوو لە تۆ
هەر بۆیە سەفەر بڕیاری منی دا
ئیمزا
شەو
لە دەرگای عەقڵم دەدا و
بۆ تۆزقاڵی خەو دەگەڕێ
خەو لەماڵی عەقڵم نیەو
بۆ سێبەری یار دەگەڕێ
ئەی حەزرەتی بەرد
مەگەر پاش تۆی ناوادەی سەفەر

خانەقای عیشق دابخەم و
خەڵوەتی ویساڵ بکێشم ..
بازنەیەک من بە دەوری خۆیدا بکێشێ و
دەخێک شەهیدم بکات لە زیکری تۆدا
ئەم خەڵوەتە گرانە قوربان
ئەم ئیمتیحانە ناوارە بوو
پێدەچێ (بەرەو شێت بوون)م بیات

٢٠٠٣/١٢/٨-٧

# ژیان هەناسەی دێتەوە بەر



بەم بەیانیە خەواڵووە
لەڕێی چ خەمێکدا وەستاویت
دەست لەکام نەسیمی عەیار پان دەکەیتەوە
تا لەدزینی دڵە بێ ترپەکاندا هاوبەشت کات
ڕێگە بدە بەهەور
بۆ دڵێ تەنگیت .. ڕەهێڵەیەک خەم ببارێنێ
ڕێگە بدە بە بروسکە
دڵی هەردووکمان بکات بە خەڵوز
تۆ لە تۆرانی نەورەسەکان تێناگەیت
من چ حەیرانێکت بۆ بچڕم .. !!
تۆ هەر دێت و چەپکێ خەمی نوێت پێیە بۆم
نازانم لەکام ئەستێرە ئەدرەسی
ماڵە وونەکەی دڵمت بۆ بپرسم

لەتەنیایدا کاڵبوومەتەوە
ئیدی نەوارە کۆنەکانی عیشق لێنادەمەوە و
گوێ لەو تەهلیلە موقەدەسانە ناگرم
کە تۆم تیادا وەک فریشتە دەبینی
دەڕۆمەوە بۆ لای خۆم و
لەکونجی هەرای ئێوارەکانمدا
تابلۆیەک بۆ شێتبوون دەکێشم
دەبمەوە بە قوتابیە زرنگەکەی جوگرافیا و
نەخشەیەکی دی بۆ ژیان دەکێشم
لەگەڵ بادا سەمایەک بۆ ئیمپراتۆرییەتی حەزەکانم دەکەم
لەتەنیشت گیاجاڕە خەم لێنیشتووەکانەوە
خەونی دۆزینەوەی خۆم دەبینم
گوێم لەمانگە بە چرپەوە بەدەریا دەڵێ:
نامەوێ ئیدی خۆم لەتۆدا ببینم
کە سپێدە نیلۆفەرەکان رادەمووسی
گوێم لەئەستێرەیە سکاڵا دەکات لەدەستی ورشە و
دەیەوێ لەنێوەندی شەوگاری
پرچی کچێکی نەشمیلانە خەونی کشان ببینێ
شەرانگێزانە خۆم فڕێدەدەمە
گەمەکانی جەنگەوە و
کەس لەگەڵما ناجەنگێ
چونکە لەبۆتەی مرۆڤ بوونم لەم زەمینە



بەترسنۆکم دەچوێنن
لەناوەڕاستی گومانەکانمدا ئیش بۆ
سڕینەوەی حەقیقەت دەکەم
دەبمە غروبێکی دڵتەنگ و دەگوزەرێم لەم شەقامەوە
لەئامێزی دارتێلەکانی شاردا
هەموو حەزەکانم خەو دەیانباتەوە و
سپێدە دەبنەوە بە گەلا و جارێکی دی
دەکەونەوە سەمای هەڵوەرینێکی ناوادە
گوێم لە بەهەشتە باسی بێ تامی هەناسەکانی خۆی دەکات
پرچ بۆ هەناسە ساردی گێلەکان دەڕنێ
دۆزەخیش وەکو من خۆی وون کردووە لەدەست تاوان
چیدی نایەوێ چاوەکانی (حەبیبە) لە (ئالی) پەنهان بکات
بیابان پەیامی فەنابوونی پێیە و
سەرابەکانی مەرگی گوڵە گەرمیانیەکان
دەکات بە حەقیقەتێکی سوور و
بەتابلۆیەکی بێ چوار چێوە و
بەنەسیمێکی ڕەدوو کەوتوو ..
مەرگ تازێباری شەپۆلی دەریاکانی خوێنە
مەرگ خەریکە دەمرێ
خەریکە بیری دەچێتەوە
وەکو جاران ماچەکانی بنێرێت بۆ لێوی ژیان
ژیان هەناسەی دێتەوە بەر

هەناسەیەکی نارنجی
هەناسەیەکی کورت ...کورت خەریکە دەخنکێ
خەریکە پێمان بڵێت:
من دەمرم و
ئێوەش ئیدی دڵداری لەگەڵ مەرگ بکەن
خەریکە وەسیەت بکات و بڵێت:
چوار دیوار دەبێت یەک بانی هەبێت
خەریکە پێمان دەڵێت:
شاخ و دەریا و بیابان تەلاق بدەن
بەچاویا دیارە دەیەوێ
پێمان بڵێت:
تابوتی چەک سازبکەن
پرسەی ژیان و مەرگ
لەپرسەخانەی پێکەنینێکی ناشیریندا بگێڕن
حەز دەکات
زۆر... زۆر حەزدەکات رەها بین
لەتەنیشت رەهایی بادە خەواڵوەکانەوە
سەمایەک بۆ مەستی نیشتمانی دزراو
لەگەڵ زرەی شوشەکانماندا ئەدا بکەین
دەممان پێکەنینی تیا گەناوەو
سەرمان لەکاڵەکێکی تەپیو دەبەنگترە
دڵمان شەڕی لێدەباری و



ترسنۆکترین هێزین
ماڵمان لەسەر مێزی مەیخانەکان بەش دەکرێت و
دڵمان لەناو هۆڵی
ئیمبراتۆرەکان لەسێدارە دەدرێت
فوو لەمۆمی هیوا دەکەین و
پەڕەمووچی ئەم سکێچە دەشکێنین
جوگرافیامان دەدەینەوە دەست
ئەهریمەنەکانی خێڵی تاریکی
روگەمان دەگۆڕین لەخۆرەوە
بۆ ئەشکەوت
دەچینەوە بەردەم دەهلیزەکانی
کۆشکی فیرعەونەکان و
نیشتمانی دزراو دەبینین بە مۆمیاکراوی
پێکەنینی ئەو درنجانەمان هەر لەخەیاڵە
کە دەستە .. دەستە کچەکانیان بردین
بۆ دیوەخانی شازادەکانی بیابان و
بۆ شەوە سوورەکانی
پێ پەتیەکانی مەملەکەتی غەدر
تا بەمەدا دیارە ژیان هەناسەی دێتەوە بەر

٢٠٠٤/٦/١

# تەنیایی



ماڵی گوڵەکانی سۆزی تۆ
وا لەتەنیشت
هەڵوەرینی حەزەکانی منەوە
ئینجانە خاڵیەکانی لێوم
ماچی وشە خەمینەکانی تیا دەڕوێنم ..
لە مەعبەدە خامۆشەکەی هزردا
راهیبەی شیعرە لە خاچ دراوەکان
ئەشک بۆ پەژموردەیی
رەنگی سرووش رۆ دەکات
پەپولەیەک لەگەڵ سروەدا
سەما دەکات و
چاو لە شەونمی سەرگەڵاکانی دادەگرێ و

ماچ بۆ گوڵێك فڕێدەدرا
كورسیەك چاوەڕوانی دانیشتنێكە و
مێزێك شێوەن بۆ
جودا بوونەوەی پەرداخەكان دەكات
پەنجەرەیەك(با) پەردەكانی
لا دەبات و
كوڕێك وا دەزانێ كچێك لێوەی سەر دەردێنێ
چاوێك لە نووسین و بێزارەوە
خامەیەك دەیەوێت بنوێ
پەڕەیەك سنگی كردووەتەوە
بۆ ماچەوشەی خامە خەواڵوەكەو
(با) ختوكەی گوێی خەتەكانی دەدات
ئەم زەمەنە بەر بەرییە
هەموو رەهەندەكانی شێواندووەو
دەیەوێت لە ژێر كورسیەكان
دانیشین و
دەستەكانی خۆمان راموسین لە بری لێوی تەڕی مەعشوقەكان ..
لەگەڵ بالیفێكدا
پیاسەیەك بە نێو خەیاڵدا
دەگەمە كچ
لەگەڵ كچدا



پیاسەیەك بە نێو عیشقدا
دەگەمە جودایی
لەگەڵ جوادییدا
پیاسەیەك بە نێو عەبەسدا
دەگەمە تەنیایی
تەنیایی وێنەیەكە رەش و سپی
چوارچێوەكەی شكاوەو خوار بووەتەوە
تەنیایی من دەدات بە شەڕدا
لەگەڵ خۆم
تەنیایی من دەكوژێت بەدەستی خۆم
تەنیایی دواجار دەمكاتەوە
بە هاوڕێی خۆم

٢٠٠٣/٦/٢

# تەنیاییەکی ئەبەدی



دەبارێم لە روخساری ئاسمانێکی شەرمنەوە
بەخشوعەوە نوێژی هەموو حەزە تاعونیەکانم
لەتەنیشت پیاسەی پەپولەکانەوە ئەدا دەکەم
بە پەلکی ئێوارەیەکی خەم لێنیشتوودا
مەراقێك دەچمە دییەنی کاروانسەرای
دواهەمین تیشکی سەر شووشەی پەنجەری ژوورەکەم و
یەکەمین تەهلیلەی ماچە خۆڵاوییەکان ..
لە پیرترین شەوی مردنا دەگەیەنمە
دەرگای جوانترین ئەجەلی خۆم ..
تەقەللای مردنێکمە لە هەناسەدان بچێت
هەڵوەدای فرمێسکێکم
کە هەرگیز چاوەکانم پێشوازی لێنەکردوون ..

گوێم لە قاغە قاغی ئەو قەلەڕەشانەیە
کە لەسەر یەکەمین جەستەی من
دوعای دواهەمین هەناسەم دەخوێنن ..
دەستەکانم پڕ پڕ بوونە لە پەشیمانی
ئەو چرکانەی دەستێکم تیا راموسیوەوە
دەستێکم تیا گوشیوەوە
دەستێکم تیا بینیوە وەک تەوقێک لە گەردنم دەئاڵا ..
بۆنی دوکەڵی جگەرە نەخۆشەکانم
هێرشی خەمەنگێزترین هەناسەی تاڵ شاباشی
دەرو دەلاقە رووتەکان دەکەن ..
لە پەڕاوی رەهایی بارانەکانەوە
حەقیقەتی رەهایی ئەشک دەبینم ..
واهیمەیەک کردوومی بە دوو بەشی تەریبەوە
لە ئێوارەی هیچ خۆرنشینێکدا یەک ناگرمەوە ..
ماچێک کردوومی بە سەر بەشەوە
لە دەست لەملانێی هیچ شۆخێکدا کۆنابمەوە ..
شەڕی شێتی .. یەخەی
هەموو جوانپەیڤەکانم دەگرێ و
لەزۆرانێکی نابەڵەددا
تەقەڵلای بردنەوەمە ..
دەمێک سەرەو خوار



لەگەڵ دوو وشەدا هەڵمدەواسێ و
دەمێکی دیکەش پەتی نەعرەتەم دەبێت و
هەموو پێتەکانیشم دەداتەوە دەست ..
بانگێک دەمباتە نێو میحرابی
مزگەوتە بۆن مردووەکانەوە
سەمایەک فێری ئیلحادم دەکات ..
دەبمە مەسیحێکی شەرمن و
لە دەرگای هەموو خاچەکاندا
چاوەڕێی هەڵواسینمە ..
دەچمەوە کۆڵانی
یەکەم یاریم لەگەڵ کیژۆڵە چاو سیمریاوییەکان و
پێکەنینم بە منداڵیم دێت
کە چەند گەمژانە دەمڕوانیە
خۆر ئاواکانی تەمەن و
چەند کاڵفامانە دەستی نزام بۆ گەورەبوون هەڵدەبڕی ..
لاپەڕەیەکم نەماوە تیای بنووسم
کەچی هێشتا نووسینێکم نەکردووە ..
شتێک نەما شیعری بۆ نەڵێم
کەچی هێشتا شیعرێکم نەوتووە ..
ئەمێستا دەمی رووتبوونەوەمە و
پەتیم لە هەموو عەقڵێک

پەتیم لە کۆلارە تەقلەبازەکان
پەتیم و بە هیچ پۆشتە نابمەوە
پەتیم و ئارەزووی رووتبوونەوەیەکی رووتترم ..
ئێوارەیەک شۆخێکی عەیار
بۆ تار کردنی پەپووی خەمە ناوادەکانم
کۆلارەیەکی بە تاڵی پرچە درێژەکەی بۆ دروست کردم و
تا ئێستاش کپانە لە نێو کتێبەکانمدا لە هەوای خۆی وەستاوە ..
بیرمە ئێوارەیەک لەگەڵ یەکەمین زەنگی مۆبیلەکەم
چاوەڕوانی دوایین بڕیاری خانمە دڵبەرەکەمم دەکرد
کەچی نە زەنگەکە ئەو بوو
نە ئیدی زەنگی کردەوە ئەو بۆم ..
سۆفیانە ئێستاش چاوەڕوانی پەشیمانی ئەوم
دەرویشانە زیکری ڕۆژانی پێکەوەبوونمان ئەدا دەکەم
شێتانە دێڕەکانی دەڵێمەوە
منالانە چاوەڕێم بگەڕێتەوە بۆم
کۆیلانە لە نێو قەفەسی یادەکانی ئەودا
ئاویلکەی فەنا بوونمە..
دەم نە دەمی ماچ بوو
نە دەمی سەفەر
دەم نە دەمی شەڕ بوو
نە دەمی عیشق



دەم نە دەمی ماچ بوو
نە دەمی جنێو
دەمی ئەو دەمەکانی دەمی لاویمی کوشت
دەمی ئەو دەمەکانی عاشق بوونی دزیم ..
ئارەزووی ونبوونێکم لەهەوردا
تا لە ئێوارە مەنگەکانی پاییزدا
بۆی ببارێمە سەر لمی ڕۆخی دەریاکانی مەنفا
ئارەزووی مردنێکمە
لە تەنیشت گۆڕستانی حەزەکانی ئەوەوە بنێژرێم ..
دەبمە ئەو و ئەویش نابێتەوە خۆی
دەبمە ئاسمان و نابێتەوە خۆی
دەبمە زەوی و نابێتەوە خۆی
نازانم دەبێت خۆی لە خۆیدا
بەرەو کوێ سەری هەڵگرتبێ
کام دوکانی عەتاری بۆ بگەڕێم
کام سات..!!
کام ڕۆژ .. !! بکەمە ژووانە ناوادەکانی بازاڕ و
لە زەردەخەنەیەکی شەرمنیدا
قەرەبووی هەموو عومری بە هەدەر چووم بکەمەوە ..
کام ئاسمانی بۆ بگەڕێم
کە ئەو لەسەر زەمیندا نەمابێ

کام کتێبی بۆ بگرمەوە
کە ئەو تەلیسمی پیرۆزترین عیشقی شکاند
شێتیەک بانگم دەکات بۆ سەماکردن ..
سەما لەگەڵ دوایین پێکی شەوە بێشەرمەکان
سەما لەگەڵ گەمژەیی خۆم و
سەما لەگەڵ بڕیاری .. تەنیاییەکی ئەبەدی

٢٠٠٤/٩/١

# دەستێکت ببەخشە بەو خەنجەرە



لە وەرینی ئەو گوڵانە تێناگەم
نازانم چ ڕەشەبایەکی داوێن پیس میوانە لایان
نیگا عیشقاوییەکانی مانگ دەبینم
لە درزی سوخمەی دەریاوە سەمای تریفەکانی دەچنێتەوە
فرمێسکی هەوریش دەخوێنمەوە
کە نەزیفی گوناهەکانی ئایەتی جوداییە
دەبێت کەسێک لە تەفسیری ئەم یەقینە بگات ؟!
کە پێ بە پێ نیگاکانی پەپولەمان بردەوە حزوری ئینجانەو
باخچە بە باخچە
بۆ دڵخۆشترین گوڵ گەڕاین و
سەرشێتترین دڕکمان ناسی
ئا .. ئەمەیە فەلسەفەی نەزانینی چوونە باخچە..
لە تەقەللای ئەو پەروانەیەش حاڵی نابم

که سەرەنجام خاکسارە لە دووی عیشقی مۆم ..
لە دڵی ئەم خاکەدا
واهیمەی زیندوو بوونەوە وێنەیەکە چوارچێوەدار
ئەمەیان رۆئیای شێتێکی لە من شێتتر بوو ..
من دەزانم هەر دەچمەوە پەرستگا چۆڵەکەو
دوعای جوان بوونەوەتان بۆ دەخوێنم
بەڵام کێ لە نیگا مەیوەکەی خوداوەندە پیرەکە تێدەگات ..
منیش تێناگەم .. بەڵام دەزانم
رۆژێک دادێ شەقام دەمباتەوە کوچە
کوچەش بۆ منداڵیو
منداڵیش بۆ نەبوونێکی ناشیرینتر لە بوون ..
گەر ئەمڕۆ .. لێرە خوێنم حەلاڵی رژان نەبێت
رەنگە سپێرە تەوبە لە قەڵەمەکەم بکەم
بەڵام وشە .. نا
رەنگە ئیدی بە تخوبی هۆشیارییدا گوزەر نەکەم و
نەفرەت لە ئاگایی بکەم
بەڵام خەیاڵ .. نا
گەر قەدەر مۆڵەتم بدات
حەزم هەیە لەو داری کاتژمێرە
بەشی هەموو تەمەنم چرکە بوەرێنم
بەڵام ئەفسوس کە پێکەنینی خۆر وەڕسم دەکات و
کلوە حەزە تاریکەکانم دەتوێنێتەوە ..



من پڕ خەتاترین خەتام بێ خەتایی بوو
نەمزانیبوو نزا بۆ نەوەرینی گوڵ خەتایە
نەمزانیبوو نزا بۆ بۆگەن نەبوونی باخچە خەتایە ..
تۆش دەتوانی لەگەڵ ئەو هەرمێ بۆگەنانە
بچیتە سەفەری پاک بوونەوە
پاک بوونەوە لە بەرائەت .. لە جوانی ..
خۆگەر لە بارینی بەفری عیشقدا
لە ژێر پێی قاچاخچیەکانی خەتا بووی بە قوڕ
بیرت نەچێت
ببە بە گۆزەیەک بۆ(مەی)ە رژاوەکەی(خەیام)و
پڕ پڕ بەو .. بیر لە خاڵی بوون مەکەرەوە
ئەگەر لە سووتانی مێوەکانی شیعردا
بووی بە دوکەڵی رەنگاو رەنگ
بیرت نەچێت
تەڕی لە رەگێکدا بهێڵەوە
تا رەزە سووتاوەکەی(دیلان)
لەوێ دەم بەشی پێکێ شەراب
هێشووە چاو مەستەکانی بگەڕێنەوە ..
من نامەوێ(جەللاد) بناسم
کە خۆشم جەللاد بم
بەڵام تۆ لە دووی(دواهەمین هەنار) وێڵیو
بیری خۆتی دەبەیتەوە

که خۆت جەللادیو
دەستەکانت ڕەنگی هەموو گوڵە هەنارەکانیان دزیوە ..
بڕوانە ئاوێنە چکۆلەکەی پشت دادانەکای
منداڵی
ببینە تۆ خەتایەکت نەکردوە تا جوان بیت ..
تێناگەم لە هەناسەدان و
نووستنی ئەو ئاسمانە دڵتەنگانە ..
هەر بە ئاستەم ئاگام لێیە
لە دوایین فارگۆنی ئەم بوونە .. نەبووەوە
وەنەوز بردوومی بەرەو هیچ بوونەوە ..
خێراکە
دەستێکت ببەخشە بەو خەنجەرەی داماوە بۆ کوشتنی من
تۆ نەبیت
منی داماویش لە حەسرەتی نەهاتنی مردنا .. دەمرم
تۆ لەوێوەو من لێرەوە
با هەموو ڕێگاکان بسڕینەوە
تا چیدی باڵندەکان نەگەڕێنەوە بۆ جەنگی نەغمەو
پاسارییەکان.. جریوە گەروویان نەتاسێنێ ..
ئەی باخچە بێ گەڵاکان و
ئەی گوڵە بێ ڕەنگەکان
لە ئێوارەدانی ئەم شەو و ڕۆژەدا
کێ دڵنەوایی نەسیمە سەرلێشێواوەکان دەکات



کێ لە حیکمەتی بەدبوونی من تێدەگات
کێ دەرگای عیشقە دڕۆزنەکانم لەسەر نغرۆ دەکات
من لەوێندەر .. لە تەنیشت ڕازی دڕۆکانی سوڵتانەوە
کۆشکی بەدمەستیەکانم خاپوور دەکەم
لێرەش .. لە واهیمەی حەزە شووشەییەکانمدا
خەونی سەرسەریترین گوڵ دەبەمەوە بۆ باخچەو
هەموو بەرە شەلاتیەکان دەگرمە دڵم
تا لە شەقبردنی هیچ ماچ و دەست گوشینێک نەترسم ..
نامەوێ ئیدی وەکو فیرعەونە ترسنۆکەکان
لە ژێر پەرچەمی سپیەوە
خەونی خوێن ڕشتن ببینم
پێدەچێ بمەوێ گوێ بۆ گۆرانیەک ڕادێرم
کە هێشتا کەسێک ئیشتیهای چڕینی نەکردووە
دەمەوێ یەک پەرداخ ئاو بخۆمەوە
تا دەلیل بێت بۆ ئەوەی
لە بەدمەستیشدا ئارەزووی ڕامووسانی دەریامە
ئێمە لە داڵانەکانی خەوندا
بۆ پەنجەرەکانی فڕین گەڕاین
دەرگاکانی نیشتنەوەشمان لەسەر داخرا
دەنگی تارێک دەهات
لە نوزەی خەیاڵێکی باڵ شکاو دەچوو ..
یەک .. یەک

خشتی دیوارەکانی واهیمە گەڕاین و
حەیرانی بەرحاڵی بوونمان لە بوون .. بۆ چڕین و
هیچ ئاسمانێک
بەسەر تەرمی هۆشیارییماندا نەگریا ..
هەموو دەنکەکانی تەسبیحی جوانیمان
لە چاڵی مورێنی کپۆڵەکاندا دۆڕاندو
بە تەنها پیاسەیەکیش بارتەقای شێتیمان نەدرایەوە ..
دەمی منالی
ژیان .. لە گەمە دەچوو لەگەڵ مردنا
دەمی هەرزەیی
عیشق .. لەشەڕ دەچوو لەگەڵ مردنا
دەمی گەورەیی
شەڕ .. شەڕ بوو لەگەڵ مردنا
دەمی شەڕ
شەڕ .. سۆزانیەک بوو
بێ ئیختیار دەچووینە جووت بوونی
لەسەر سنگە خوێناوییەکەی پێکەکانی مەرگمان خڕ دەکرد ..
ئەو دەم وەرزێک نەما
بۆ شنەی گوڵەکانی پێکەنین
رۆژێک نەما
بۆ دۆزینەوەی رەهەندەکانی گەمژەیی
شەوێک نەما



بۆ لەیەک دانی بادەکانی حەقیقەت
نەما .. هیچ نەما
من مام و هیچم نەما
بەهارێکی ترساو هات و گوڵەکان تۆرابوون
نەسیمێکی بریندار هات و
قەرسیلەکان خەوتبوون
هێشتا هەر لە دالانەکانی خەوندا بووین
شەقڕنی باڵی شەمشەمەکوێرە ئالا بە دەستەکان لە بیستنیان خستین ..
دەرگاکان مۆر کران و بوون بە دیوار
پەنجەرەکان هەر نەبوون ..
ئێوارەیەک کە یەکەمین نمەی بارانی پایز
تابلۆی گریانی کێشا لە سیمامدا
شەماڵێک گەلا زەردە جوانەکانی لێبردم
گەلا زەردە جوانە پڕ خشپەکان ..
گەلا زەردە جوانە پڕ خشپە زۆرەکان ..
من دەگریام بۆ تەنیایی خۆم و خودا
من دەگەڕام بۆ دوایین خاچ
تا خۆمی پیا هەڵواسم
نەمزانیبوو مردنیش قەدەغەیە .. وەکو ژیان
نەمزانیبوو بە تەنیشت هیچ قەلایەکەوە
جەنگی ئاشتی هەڵناگیرسێ ..
لە دوور .. گوێم لە کەڕەنای

هەستانەوەی فیرعەونەکان بوو
کە تارمایی هەرەمەکانیان ئاسمانیشی دەترساند
گوێم لە تەپڵی ژێر کەوتن بوو
ئالآیەکم دیت .. وەکی هیچ ئالآیەک .. نا
هێشتا ڕێی چوونە دەرەوەمان
لەو دالآنانەی خەون لێدیار نەبوو
فەتوای سڕینەوەی ئایەتە ڕەنگاو ڕەنگەکانمان دا ..
هەموو کتێبەکانمان سووتاندو
دوکەڵێکمان نەدی لە شیعر بچێت ..
ڕەفی هەموو کتێبخانەکانمان شکاندو
نەبوونە چیرۆکێک ..
هەموومان پێکەوە مردین و
نەبووینە ڕۆمانێک ..
هەنگاوەکان هەمیشە دەیانبردینەوە
بۆ نائاگایی
بۆ خەوتن لە دەریادا
بۆ سەما کردن لە ئاگردا
دەخنکاین و دەسووتاین و
قاقامان لێدەدا بە هیچ
دەتریقاینەوە بە ئازارەکانی خۆمان ..
هەموو شتێکمان دۆڕاندو
واماندەزانی سەرکەوتین



ئەوێ دەم لە ڕووتبوونەوەی کپە حەشەرییەکان حاڵی نەدەبووین
حیکمەتی بۆنی مێخەکمان نەدەزانی
بە لێوی برینەکانمان گۆی گوڵلەکانی جەنگمان دەمژیو
نەمریمان دەدا بە مردن و
مردنیش بە ژیان ..
ژیان لە مەزادخانەکانی جەنگدا هەزران بوو
زرەی کەوتنی قەوانێک و دوو ڕۆح
یەک بەها بوون ..
تەرمی ئەستێرە کوژراوەکانمان
بە کۆڵی خەجاڵەتیدا بردەوە بۆ ئاسمانە دڵتەنگەکان و
کەوتینە خوێندنەوەی
فەلسەفەی تفی بەرەو ژوور
لە ژوورە چۆڵەکاندا هەڵدەکورماین و
ئەو ئاوازانە دەهاتەوە بەر گوێمان
کە عودی غەریزەکانی جەللادیمان دەیژەند ..
ئیدی زانیمان جەنگ هات و گوڵەکانی برد و
باخچەکانی بێوەژن کرد ..
خێراکەو
دەستێکت بیفشە بەو خەنجەرەی داماوە بۆ کوشتنی من
تۆ نەبیت
منی داماویش لە حەسرەتی نەهاتنی مردنا دەمرم ..
من ئەم شیعرە تەواو ناکەم

خواستم ئەوەیە
تۆ نەیخوێنیتەوەو وەکی جاران
بکەویتە رنینی پرچ و واوەیلا..
جا تیلاوەتی ئەو درۆیانەش لە بیر دەکەم
کە لە ئینجیلی هەرێمە دزراوەکاندا هاتووەو دەڵێت:
ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی ..
ئەی رەقیب هەر ماوە ..
ئەی رەقیب هەر ..
ئەی رەقیب ..
ئەی ..
ئە ..
ئ ..

**١٣ ئەیلولی ٢٠٠٤**

# پەیکەرە ماندووەکان



لە تەنیشت رامکردنی ئیلهامە چیاییەکانەوە
ماچی وەنەشەیی ئەرشیف دەکەن پەیکەرەکان
پەیکەرێک و دوان و دەو هەزارەها پەیکەر
بە کۆرس سرودی دۆر جوانەکانی بوون
بە گوێی مرۆڤدا دەچرن
گەمژەکان هەمیشە پەیکەریان لا پەیکەرە
نازانن کە خەونی پەیکەر
سەر ئەوەندەی خەونی مرۆڤەکانە ..
تۆ بڕوانە ئەو پەیکەرەی
لەناو لەپیەوە
کۆتری سپی بۆ ئاشتی هەڵدەفڕێنێت و پشوو نادات
مرۆڤ هەر چەند جارێک
دەتوانێت کۆترەکان هەڵبفڕێنێت بۆ شەڕ
ئیدی تەمەن گەمەی مەرگی لەگەڵ دەکات ..

پەیکەر بەر لەوەی لە دایک بێت
یەک دوعای قبوڵ کرا
ئەویش نەفەس درێژی بوو
پەیکەر بەر لەوەی فێری خوێندنەوە بێت
دەبێت بە فەیلەسوف و شاعیر و شۆڕشگێڕ
پەیکەر بەر لەوەی یەک وشە فێربێت
زۆر جار زوبانی بەگوڵ دەپژێ
پەیکەر لەوەی بالغ بێت
هەزارەها ژن عاشقی بالآی دەبن و
دەیانگەیەنێت بە ئۆرگازم
پەیکەر بەر لەوەی چاو لە هیچ کچێ دابگرێ
هەموو کچە جوانەکان وا دەزانن عاشقانی ئەوانە ..
پەیکەر بێ ئەوەی لەگەڵ هیچ ژنێکدا بخەوێت
هەر ڕۆژێ لە شەقامێکدا نەوەیەکی دەدۆزرێتەوە ..
پەیکەر جگەرەش دەکێشێ
دوکەڵ ناکا بەسەر کەسدا
پەیکەر زۆر جوانە لە پەیکەر دەچێت
بیست ساڵ بەر لە ئێستا بوو
نامەیەکم نارد بۆ شۆخە پەیکەرێکی رووت و
داوام لێکرد شەوێک لەگەڵیدا بخەوم
ووتبوی: هەر ئێستا
بەر لەوەی لێرە بڕۆم وەڵامی دەدەمەوە ..



چرکە بە کاتژمێری جیهانی پەیکەر
سەدەیەک  پاش نەمانی من دەکات
پاش دە ساڵ لە نامەی دووهەمدا بۆ نووسی:
هێندە دڵڕەق مەبە
چاوەڕوانی نامەتم ..
هاتە خەوم و پێی وتم: من ماڵم نیە
گەر لەم پارکەش لەگەڵ تۆدا بیبینرێم
تا دەمشکێنن .. بەردباران دەکرێم ..
پەیکەر زۆر لە ئێمە عاشقترە
دەتوانێ بە نیگاکانی پێمان بڵێت
کە چی دەڵێت ..
پەیکەر وانەی بەبەردبوون دەڵێتەوە
کەس گوێی بۆ ڕانادێرێ
لە ئەلبومی پەیکەرێکی ریش سپیدا
وێنەی فرمێسکە زۆڵەکانم دیت
کە کچە زۆرزانەکان لەیەکەم ژواندا
بۆ فریودان ڕۆی دەکەن
وێنەی درۆ شاخدارەکانم دیت
کە کوڕان بۆ کچانی دەکەن
وێنەی کورسیە شکاوەکانم دیت
وێنەی گۆرانیە نەوتراوەکانم دیت
وێنەی ئاوازە نەژەنراوەکانم دیت

وێنەی پێنووسە ترسنۆکەکانم دیت
وێنەی مردووە زیندووەکانم دیت
وێنەکانی زۆر بوون زۆر
وێنەی خۆمم دیت مردبووم
وێنەی دایکم زیندوو بوو
وێنەی سەرکردەم دیت گەدا بوو
وێنەی حیزبم دیت خائین بوو
وێنەی ئینجانەم دیت
کە گوڵەکانی تۆرا بوون
وێنەم دیت .. وێنەی زۆر .. زۆر
لە گیرفانی سەر دڵی پەیکەرێکی لاوردا
وێنەی شەقامێکی گەورەی تیا بوو تۆزی لێ نیشتبوو
لە پشتی نووسرا بوو ..
هەموو شەوێ دە ساڵ
بە ئومێدی گەیشتن بەو شەقامە خۆم دەکوژم
لەناو زەمیلەی دەستی پەیکەرە کچێکی لادێییدا
رومانە لە جێی رومان بوو
لە شانی دار پەیکەرێکدا
تفەنگ لە جێی توفاح بوو
پەیکەر سازێک زانی کە خەریکی
نووسینی چیرۆکی(پەیکەرە ماندووەکان)م
منی رەجم کرد لەسەر زەوی



ئەوی کرد بە عاشق و
منی کرد بە تاوانبار
بۆ ئەو پێکێک ماچی ناردو
بۆ من (نیو قاپ) فیشەکی تەقیو
بۆ ئەو عاساکەی موسا و
بۆ من خاچەکەی عیسا
بۆ ئەو بوراقی باڵدار
بۆ من سێوەکەی ئادەم
بۆ ئەو مورید و دەروێش
بۆ من فریشتەی گیان کێش
من مردم و ئەو رۆحی دزیم
منیش بوومە پەیکەر و
هیچ پەیکەرێک نەبووە من
پەیکەر چیرۆکی منی تەواو کرد و
من چیرۆکی هیچ پەیکەرێکم بۆ نەنووسرا

٢٠٠٣/١١/٣٠

# ده پایز



دە پایز .. بە دیار هەڵوەرینی خەزەڵەکانەوە
دەمڕوانیە زەرد بوونی شۆستەو شەقامەکان و
وامدەزانی لەگەڵ ئازاری گەڵاکاندا
سەمای عیشق دەست پێدەکات
دە زستان
لە ناو باران و کڕێوەو رەهێڵەدا
بە بێ چەتر و رەشپۆش پیاسەم دەکرد و
لە هەور رادەمام و
پەنجەم دەدایە بەر هالاّوی دەمم و
وامدەزانی
لەناو دڵۆپەو پروشەی باران و کڕێوەدا
گیانی عاشق بوون دێتە خوارێ ..

ده بەهار
لەگەڵ گرمەی گەواڵە هەورە کۆچەرییەکان و
لەگەڵ دەشتە پڕ لە گوڵاڵە سوورەکان و
لەگەڵ چەپکە نێرگز و
لەگەڵ جۆشیرەدا وێنەی یادگاریم دەگرت و
وامدەزانی
سیمای عاشقیان پێیەو
دەیبەخشن ..
ده هاوین
شەو تا بەیانی لە چۆڵییەکانی دەرەوەی شار و
لە تەنیشت سنەوبەرەکانی باخی گشتی و
لە شەقامە چۆڵەکانا و
لەگەڵ دەستە هاوڕێی عیشقزەدەدا
گۆرانیەکانی عیشقمان دەوتەوەو
وامدەزانی
هەناسەمان عیشقاوی دەکات ..
دانی پیا دەنێم
ده ساڵەو من نەفامانە عاشقی تۆ بووم گوڵێ
بەڵام تۆش دانی پیا بنێ
کە من (دە) ساڵ
وەکو کۆیلە چاوم بڕیبووە



پێنووسەکەی نێو پەنجەت و
چاوەڕوانی یەک نامەو یەک وەڵامت بووم
دانی پیا بنێ
کە شێتێک هەبوو
بە درێژایی دە ساڵ وەکو پەیکەری پەرستگاکان
دەیڕوانیە تۆو
هەموو ڕۆژ و ساتێک سووژدەی بۆ دەبردی
دانی پیا بنێ
کە بە درێژایی دە ساڵ
نە لە گۆرانیەکانی عیشق گەیشتی و
نە نیگاکانی عیشقت خوێندەوەو
نە هۆنراوەکانی عیشق چووە ڕۆحتەوەو
نە فرمێسکەکانی عیشقت بە گریان بینی ..
دانی پیا بنێ
(دە) ساڵ کوڕێک
تۆی خۆش ویست لە خۆی زیاتر و لە تۆش زیاتر ..
(دە) ساڵ کوڕێک
هەموو شەوێ فرمێسکەوشەی دەباران ..
(دە) ساڵ شاعیرێک
شیعر بارانی کردنی ..
(دە) ساڵەو هەموو شەوێک

له چاوی ئەستێرەوە چاوی لێ دادەگرتی و

له پەنجەرەی مانگەوە

باسی پانتایی عیشقی خۆی بۆ دەکردی

(ده) ساڵەو هەموو ڕۆژێک

فەرهاد دەستی دەگرت و

دەیهێنایە سەر ڕێی تۆی شیرین ..

مەم هەناری مەرگی

له دەستی تۆی خاتوو زینەوە بۆ دەهێنا و

کەچی ئێستا

دەتەوێت بڵێی:

(ئەی شێت من لەیلەکەی تۆ نیم) ..

ئێستا و بەم زستانە

دەتەوێت بە سەفەرێکی ئاوارە بارتەقای

سەمای پەپولەکانی بەهار بدەیتەوە

کە لەتەنیشت منداڵێتیدا

باڵەکانیان وون بوو ..

دەتەوێت جوانی ببەخشی بە قوڵنگیی

پۆلە مەلە کۆچکردووەکانی پاییز

کە پێدەچێت بەهار نەگەڕێنەوە ئەم هەرێمە

تۆی لێنەبێت

دەڕۆیت و



تەختە ڕەشەکە جێدێڵی و یەک خاڵیش

ئاڵێشی و تەباشیرەکە فڕێدەدەیت

پۆلەکە چۆڵ دەکەیت و

هیچ کچێکی دیکە ناوێرێت لەسەر کورسیەکەی تۆ دانیشێ

نەبادا سەفەرێکی پەژموردە و ناشیرین

تۆ ئاسا لەدەستی عاشقەکانیان دەربێنێ

کچان ئاگر لە کورسیەکەت بەر دەدەن و

ناوی دەنێن کورسیە شوومەکە

کوڕانیش ئیدی گاڵتە بە کچان دەکەن و

پێیان دەڵێن:

هەڵپەرست و عیشقنەزان

دەڕۆیت و

زەردەخەنەکەت ئەرشیف دەکەیت لەماڵەوە

بۆ زەمەنێکی دیکەی عاشق بوون

بۆیەی سەر پەنجەکانت دەگۆڕێ بە سوورێکی ئاڵ

ئاڵ .. وەکو خوێنی ڕژاوی من و

تەمسیلی کوشتنی من دەکەیت لەبەردەم ئاوێنەکەت و

قاقا .. پێدەکەنی

وەکو گۆزەیەکی ڕژاو

پاش خاڵی بوونەوە لە پێکەنین

گریان دڵت دەگوشێت و

فرمێسک چاوەکانت لێڵ دەکات ..
ئەو دەستە گوڵەو
ئەو زێڕانەی زاوا بۆی کڕیوی
دەیکێشی بە ئاوێنەکەدا و
زڕەی ئاوێنەکە دێت و دەشکێت
پیاسەیەک بە نێو
دالآنەکانی تەنیاییمدا بکەو
لە پەنجەرەی بێ هودەییەوە
بڕوانە لە باخچەی عیشقم
چۆن گوڵە هەنارەکانی موحیبەت
تیایدا نابنە هەناری حەزو
ڕەشەبا و خەزانی دڵبەڕیت
دەیخەنە ژێر پێی موسافیرەکانی ژیانێکی پڕ وەهمەوە
کچێ وەرە
خۆ دەزانم پەشیمانی وا خەریکە
دڵت دەکا بە ڕوباری ئەشک و هەنسک
ئەم تەوقی سەفەرە
بۆچ وا دەست و پێی بەستوی
ڕازەکانی عیشقت
بە گوێی عاشقێکی بێگانە هەر نامۆ دەبن
وەرەو پەڕاوی دڵم بخوێنەوە



ئەرشیفێکە بۆ فرمێسکە وەریوەکانت
وەرەو تەماشای ئەلبومی نیگاکانم بکە
هەمووی وێنەی تۆیەو دەبنە سەراب و
سۆمای چاوەکانم لێڵ دەکەن
خانمەکەم بیرتە پرسیت:
کوا مەنزڵی عیشقی دڵت .. ؟
ئەدرەسەکەم دایتێ
لە تەنیشت دڵبەدری تۆوە بوو
بیرتە گوێم لە کەناری نەدەگرت و
دەموت هەر دەنگی تۆم پێ خۆشترە
بیرتە تەماشای ئەستێرە و مانگم نەدەکردو
دەموت لە فرمێسک و چاوی دەچن
بیرتە ترپەی باڵی پەپولەم لا گەورە بوو
لەو ڕۆژەوەی گوێم لە چرپەی ڕۆژ باشت بوو
بیرتە بۆنی گوڵم نەدەکرد
دەموت چارشێوەکەت بۆنی گوڵ و میسک و
عەنبەری لێوە دێت
ئای چ وەرزێکی شووم ئەم سەفەرە نا بە دڵەت
کت و مت لە مەرگی عیشق دەچێت
(دە) ساڵەو هەموو ساڵێک لە خاچم دەدەی
ساڵێک لە خاچی نیگای نامۆت

ساڵێک لە خاچی ڕوخساری ونت
ساڵێک لە خاچی سەرداخستنت
ساڵێک لە خاچی دوور کەوتنەوەت
ساڵێک لە خاچی ئومێد
ساڵێک لە خاچی بێ هیوایی
ساڵێک لە خاچی تابلۆو شیعرەکان
ساڵێک لە خاچی نامەو دیارییەکان
ساڵێک لە خاچی زیز بوونت
ساڵێک لە خاچی کەژاوەی بووکێنیت
ئای دڵی من
من نەمزانیبوو کە بۆ ئەم عیشقەی تۆ
دەبێ ببم بە دە مەسیح
جیهان هەموو پێدەکەنن بەم عیشقەی من
کە وەک شێتێک چۆن وێڵی دووی تاڵی تیشکەکانی خۆر دەبێ
بە دووی وەهمی کردنەوەی
دەرگا کلۆم دراوەکەی دڵی تۆوە
بێ پشوو
لە تاریکستانی تەنیاییمدا
بۆ کلیلی سۆزەکانت دەگەڕام
بەڵام هەموو ڕادەمێنن
کە بەری درەختی عیشقی من دەبینن



چونکە لە هیچ ناچێت
لە گەمژەییم نەبێت ..
تۆ لە باران دەچیت
تەڕت کردم بە عیشق و تێرت نەکردم لە عەقڵ
لە ڕەشەبا دەچیت
هەرچی جوانیم بوو بردت و
بە شێواوی جێت هێشتم
لە بەفری گەرمیان دەچیت پەنجەکانت تەزاندم و
دوو تۆپەڵت نەدامێ بۆ سەرگەمی
بیکێشم بە سیمامدا
لە تەرزەی بەهاران دەچیت
سەرو شانت کوتامەوە
بەشی زەمەنی ماچێک نەمایتەوە لام

٢٠٠٤/٢/١٤

# دەبمەوە خاک



لەو ڕۆژانەوە دێم کە تیایدا
خاک من بووم
منیش خاک ..
کە تیایدا باوکم نامرێت و
دایکیشم زیندوو دەبێتەوە
لەو ڕۆژانەوە دێم کە من نیم و
خاک هەیە..
کە دین نیەو
خاک هەیە..
کە بیابان نیەو
خاک هەیە..
کە خودا ناسین نیە و

خاک هەیە ..

کە خاک هەیەو

خاک هەیە ..

خاک لە چاوی ئێمەوە

دەیڕوانیە سپێدەکانی دەم کەل و

لە هزری ئێمەوە دەیڕوانیە

حاشیە شاخییەکەی کەناری خۆی

خاک هێشتا زوبانی نەپڕابوو

ئەو دەم ئێمەو دارستان و چیای

دەلاواندەوە ..

کاتێک لە گەرووی ئێوارەیەکدا

دوو دڵۆپ کلکمان دزی

بۆ ورگی سوڵتانەکان

ئیری کلک بوو بە تاج و

چووە سەری زۆرمانەوە

بووە میرالیا و

بوو بە نۆبڵی نۆکەرەکانی

فیرعەونە پێ پەتیەکان و

سوڵتانە بەربەرییەکانی سەردەی تاریکی و

تا ئەمێستایش وەک

شەوەی دزراو لەتاریکی لە مل دەکرێ ..



من بیرم نیە ..

باوکیشم ..

بەڵام دایە گەورە .. لە زوبانی باپیرمەوە دیگێڕایەوە

کە پیاوانی خێڵ لەشکرییان دەکرد بۆ سەر

تەتەر و ترۆمێلەکانی

لەشکری خالرز .. لە پێچی جامانەو

لە بەینی پشتوێنەکانیان

نوشتەی شێخی گەورەویان پێ بوو

بۆیە هەرمان و هەرمان ..

مان و ردێنی شۆڕشیان چەرموو کرد

مان و رووی شۆڕشیان چەرموو بوو

سەفەریان کرد و ڕووگەیان چەرموو بوو

نەهاتنەوەو مێژوویان چەرموو بوو

ئێستا حەیران و قەتار بە باڵای

شۆڕەسوارەکانی ئەو دەمەی ناو دڵی خاک و

پەنا دار بەڕووەکانی (شاخی پیرەسالێ) دەڵێنەوە ..

دەمرین و بێ ئاگا لە مردن

وەکو بوونمان و بێ ئاگا لە ژین

دەچینە بەردەم دەهلیزەکانی کۆشکی سوڵتان و

بە خۆشی سەری .. سوڵتانەوە

پێکە نارنجیەکانی دەم غروب فڕ دەکەین و

لەو سەرەوە خۆمان و
پێڵاوە شڕەکانمان دێینەوە و
شەهامەتی مێزەرەکانی مێژوومان دەدۆڕێنین ..
لولەی تفەنگەکانمان سەرەو خوار گرتووە و
لە تەوێڵی توورەی گەل دەڕوانین ..
دەخەوین و
شاخ دێتە خەونمان و
دوومان دەکەوێ و
داوای ماندوو بوونی خۆی دەکاتەوە ..
تاشەبەرد دەبینین و
بۆ گۆبەرۆکی بێپەروای سەردەمی شۆڕشی دەگەڕێ ..
چەم و کانی دەبینین و
تینوون.. تینوون
بە خوێنی کەللە سەرمان
کە بەڵێنمان دانێ
دەمێکی دی بیانکەینە سەیرانگاو
لە ئێوارەی بەهارانا
بە یادی ساڵانی زوو
پێکەوە سەر خەوێ بشکێنین ..
دەبێ کاری بکەین بۆ خاک
خاک بە باڵامان بپۆشین



یان خاک بکەینە رووگەمان
یاخود بچینە نیو دڵییەوە ..
ئەو دەمەی کە خاک دایکی مرد
من و ئێوە بووین بە برا و
کۆرپەی خاسی ..
بووین بە نەسیمی بەیانیانی پڕ لە گوڵ و
بووین بە کسپەی
دڵی پڕ ژان و کەساسی..
بووین و.. نەبووین بە هیچ ..
نەبووین بە خۆمان و خاک
نەبووین بە خاک و خۆمان
نابین بە خاکی خۆمان
نابین بە خاوەنی خاکی خۆمان
خاک نابێ بە ئێمە
نابێ بە خاوەنی ئێمە ..
دەبێ بگەڕێمەوە بۆ خاک
دەبێ بگەڕێمەوە بۆ دەریا و
لەوێ لەگەڵ شازادەکانی دەریا
تیلاوەتی شەپۆلێ بکەین
کە بیابانیەکان بخنکێنێ و
بەربەرییەکان بکاتەوە بە کۆچەرییەکانی سەدەی

بێ عەقڵی قەومەکەیان
دەمەوێ بیمەوە بە خاک..
دەمەوێ بە خاک بیمەوە..
دەمەوێ خاکی بم.. خاکی

٢٠٠٤/٩/١

# باران



دەپەڕێمەوە لەروباری گومان و
شەلاڵی درۆکانی خۆم دەبم
شەلاڵی درۆ راستیەکان دەبم
بەباڵی خەیاڵ دەفڕم بۆ ئەو زەمینەی
کە بەشی دەمێ ماچی ئاڵ دەگرێ باخچەکانی
دەفڕم بۆ ئەو ئاسمانەی
کە بەشی دوو نیگا ئەستێرەی تیا ماوە پەنجەرەکانی
لەگەڵ بادا پیاسەیەکی شەقامەکانی گوڵ دەکەم
لەگەڵ گوڵدا قەسیدەیەک بۆ کچ دەنووسمەوە
لەگەڵ کچدا نەفرەت لەئەوینی راستی دەکەین
دەڕۆمە پشت ئاوێنەکانی مانگەوە
تا حەقیقەت لە وەهم جیا بکەمەوە

دەڕۆمە دییەنی پەڕندە بێباڵەکان
تا لەئازاری نەفڕین حاڵی بم
چ شێتیەکی جوانە من لەدرەختێکی پایزی دەچم و
درەختێکی بەهاری ناسنامەکەی منی هەڵگرتووە
عیشقێک دڵی کردم بە شووشە
عیشقێک فڕێی دامە دۆزەخەوە
دەمرم و پرسەکەم دوا ئەخرێت بۆ زەمەنی زیندوو بوونەوەم
دەژیم و پرسە بۆ هەناسەکانم دەگێڕم
بە پرچی ئێوارەیەکی ئەرخەوانیدا
هەموو ماچەکانم دەسپێرمە خۆرئاوایەکی خەمین
لەگەڵ سێبەری کۆچکردووی درەختێکدا
دوایین پێکی گەمژەییم فڕێ دەکەم
تا دەمگەیەنێتە حزووری ئەستێرە بێ ئەدرەسەکانی ئاسمان
تا دەمبەنەوە بۆ عەدەمیەتی خۆم و
لەوێوە گاڵتە بەم بوونە... نەبووەم دەکەم
لەگەڵ کەوتنە خوارەوەی گەڵایەکی تۆراودا
دەکەومە خشپەی ئاویلکە
چ سەراسیمەیەکە دەژیم و مردووم
مردوویەک دەبینێ... دەخوات ...دەخواتەوە
پەنجەکانم شەڕی ترازاندنی دوگمەیان بیرچووەتەوە
لێوەکانم ڕەنگی ماچیان هەڵوەریوە
ئاسمان دەبینم دەیەوێ بەسەر سەرمەوە بنیشێتەوە



هەور لەهەناسەی منەوە هەوێن دەکرێت و
لەچاوی منەوە سەمای بارین دەکات
کچێک گۆرانی بۆ شێتبوونم دەڵێت و
دەروێشێک بەشمشێرەکەی دەیەوێ ڕوگەی عیشقم بگۆڕێ
شێتێکیش پەناهەندەیەم ڕەت دەکاتەوە لەمەملەکەتی خۆیان
باوکم وشەکانم ئەسیر دەکات
دایکم دەیانگرێنێت
براکەم ئەزیەتیان دەکات
خوشکەکەم ماچیان دەکات
دەپەڕمەوە لەشەقامی ترس و
کچە قژ تاتارییەکە هەر پێم دەڵێت: "ترسنۆک"
دەرگای هەموو حەزەکانم دەخەمە سەرپشت و
ماچێک بۆ نەشئەیەک نابێتە میوانم
پەنجەرەکانم دەشکێنم و بایەک سەرێکم لێنادات
دەمەوێ بگریم
هەستم سەرزەنشتم دەکات
دەمەوێ پێبکەنم
نەستم سەرزەنشتم دەکات
دەمەوێ ببارێم
بیابانێک نیە لێی دابکەم
دەمەوێ ببمە هەڵم... ئاسمانێک نیە گەواڵەی تیا ببەستم
خۆر ڕەدوو دەکەوێ شوورەیی بۆ من جێدێڵێ

مانگ دلداری دەکات
نامەکانی گیرفانی لەرەشنوسی شیعرەکانی من دەچێت
پەیکەرێکم بێ دڵ و گیان
لەدەروازەی شاری خاپوری تەنیایی
کەچی پۆستی
شۆخە پەیکەرەکانی
چەقی شاری گوڵ و باخچەم پێدەگات ..
هەر دەمەوێ بژێمەوە
سێبەرەکەم
دەبینم لەتابوتا راکشاوە
هەنگاو هەڵدێنم رابکەم
خەم بەئەسپێکی کەحێل دووم دەکەوێ ..
زۆرانبازی لەگەڵ ئاو و ئاگر و با دەکەم
تا تەربم و بسوتێم و بفڕم بەرەو شوێنێکی دوور
گەمە لەگەڵ لاپەڕە سنگ سپیەکاندا دەکەم
پیتێک نایات ..
وشەیەک نایات ..
دێڕێ .. شیعرێ نایات پەیامی سەوزبوونەوەم بهێنێت
تا بەهارێکی دیکەی عیشق زەرد کەمەوە ..
لەناو ڕەنگا مەلە دەکەم
سکێچێک خۆی دەکات بە من
پۆرترێتێک دەچێتەوە سەر ڕەنگی ئەو



لە تابلۆیەکدا کۆدەبینەوە و چوار چێوەکەمان باڵ دەگرێت و
دەڕوا... دەڕوا بۆ دوور
رووت دەبینەوە و دەکەوینە دەشت
دەچینە بەردەم کۆشکی باران
ئاوێتەی (خاک و خۆڵ) دەبین
دەبینەوە بە چەند پیتێک لە ڕەنگی رزیوی زەوی
دەبینەوە زارۆکە چاو گەشەی خاک و
جارێکی دی ..
دەمێکی دی ..
بۆ عیشقێکی بەربەریتر لەسەحرای بووندا هەڵئەتوتێن
دەچینەوە کەنیسە بۆ تەوبە لە عیشق
خاچێکی دی بۆ تەرمی عیشق هەڵئەگرین و
ئینجیلێکی دی بۆ بەخشینی گوناهەکانمان دەخوێنین
دەچینەوە
دەم کانیە سۆزانیەکان
دوعای پاک بوونەوەیان تیلاوەت دەکەین
دەچینەوە
لوتکەی حەز و
فەتوای ڕەجمی دڵمان دەدەین
دەچینەوە لای سێبەری درەختێکی تەنیای دڵتەنگ
بۆ زاهیدی مشتێک فرمێسکی درۆ ڕۆدەکەین
دەبینەوە بەهەڵم و

ئاسمانێکی دی لێڵ دەکەین
لەگەڵ نەسیمێکی سوورا خۆمان دەگەیەنینە بیابان و
تا لێوی دڕک تەڕ دەکەین
هەر دەبارێین ..
تا دڵی لم فێرە سۆز دەکەین
تا عیشقێکی دی سەوز دەکەین
هەر دەبارێین ..
تا خەمێکی دی دەوەرێنین
تا خۆرێکی دی ئاوادەکەین
تا مانگێکی دی هەڵدێنین
هەر دەبارێین ..
تا درەختێکی دی روت دەکەینەوە
تا پاییزێکی دی دەهێنین
تا ماچێکی دی سوور دەکەین
تا جارێکی دی لەخاچ دەدەرێن
هەر دەبارێین .. هەر دەبارێین

٢٠٠٤/٤/١٧

# وەرزی فیراق



تەماشاکە دڵێک هەیە وەک دڵی تۆ
تەنها لەگەڵ وەنەوشەو پاتۆنیادا سەما دەکات
تەماشاکە ئایەتێک دەخوێنێت
تۆ حەرام دەکات لە هەموو دونیا
تۆ ئێوارەیەک باسی من و مەرگ و ماچت لە دێڕێکدا جێکردەوە
تۆ سپێرەیەک کە لە خەو رابووی
سێ پەنجەم و پێنووسەکەم بە تاڵی پرچەکەتەوە جێمابوون
من تائێستاش تۆ و شیعر و عیشق هەموو تەمەنتان داگیر کردووم
من روئیای هەموو قەسیرەکانم لەوەهمی خۆشەویستی تۆوە بۆ دەهات
من ئێستاش هەر چیرۆکێک دەخوێنمەوە
تیایدا تۆ دەبیتە شیرین و منیش بێستونت بۆ دەبڕم
من و تۆ دوو مەخلوقی تاوانباری خوداین

من و تۆ لێوان لێوی درۆین
من و تۆ تەمەنمان پێهوودە گوزەشت
هەور لەگەڵ هەر تنۆکە بارانێکیدا هەزاران وێنەی تۆی دەدامێ
باران لەگەڵ هەر نمەیەکیدا رۆمانێکی نوێی مەرگی خۆمی بۆ دەنووسیمەوە
دەریا لەگەڵ هەر شەپۆلێکیدا پەخشانی نەورەسێکی دڵڕەنجاوی وەکو خۆمی بۆ
دەخوێندمەوە
بیرمە و هەموو رۆژێک
ئەو وانەیەم دێتەوە بیر لە(کیمیا) کە تۆ رەوانت کردم
ئێستاش من وانەی (کیمیا)م خۆش دەوێ
باشتر بیرمە لە ماتماتیک هەرتەماشای تۆم دەکرد و
نەمتوانی تەنها یەک نمرەش بە دەست بهێنم
وەلێ ئەوەندە فێربووم کە تۆ لە من دەرکەن دەمێنمەوە هیچ
وانەکان هەموویان تۆبوون بۆ من
تۆ هەموو وانەکان بووی بۆ من
چ خوێندکارێکی نابەڵەدی عیشق بووم
وامەزانی سرووشێک دەگا بە تۆ و باسی عیشقی منت بۆ دەکات
لەوانەیە من شێتێک بووبم .. یان شێتێک بم
بەلاَم هەرگیز تۆ لەپەری کەمتر نەبووی .. کەمتر نیت
زۆرم هەبوو لەدڵما پێت بڵێم و .. پێم نەووتی
زۆرم پێ ووتی و گوێت لێ نەبوو
من هەرگیز پێم نەوتووی دەتوانم عاشق بم .. عاشق نەبووم



پێم نەوتووی تۆ پەرییەکی جەلادی و
دەتوانی کۆرپەی خۆشەویستی سەربڕی .. بەلاَم کردت
بمبەخشە کە نەمتوانی وەکو شیعرێک بتخوێنمەوە
بمبەخشە کە نەمتوانی هەموو ماچەکانت لە زەرفێکدا بۆ بنێرمەوە
من ناتبەخشم کە عەسرێک دەستت کردە ملی درەختێکی خەزانزەدە و
پێکەوە تا لوتکەی ئارەزوو خۆتان لەگەڵا رووتکردەوە
خۆ من تا ئەمێستاش کیشوەرێکی سەوز پۆشم لە خەز و
هەموو شەوێکیش داوا دەکەم لە قەدەر
ئەو پایزەی تۆی تیا دیلی ئەلقەکرای .. رسوا بێت
نەفرەت لەهەموو بەهارەکان دەکەم
کە نەیانتوانی تەنها گوڵێک لەدەمی پایز دەربهێننەوە
ئای گوڵێ .. خوا چەند میهرەبانە
خۆ گەرنا من وتۆ هەموو پایزەکانمان بە ماچ سەوز دەکرد
تۆ گوڵت دەوەراند و من پەیکەری تۆم پێ دروست دەکرد
ئاسمانت لێ دەشارمەوە بە نیگاکانت و پێدەکەنیت بە گەمژەییم
ئای من چ نەفامێکی زۆرزان بووم و
تۆش چ زۆرزانێکی نەفام
من نەفام بووم .. تەماشام نەدەکردی
ئەو دەمانەی چارشێوەکەت لێدەکەوت و تۆ هەڵتدەگرتەوە
من نەفام بووم .. ئەو چرکانەی
ئەو ماچانەم لێ وەردەگرتی کەتەنها ویستی تۆبوون ..

من نەفام بووم .. هەموو شەوێ
دەیان نامەم بۆ دەنووسیت و یەك دانەیم بۆ نەدەناردی
وەلێ زۆرزان بووم... كە تاهەتایە بڕیارم داوە
هەر تۆم خۆش بوێ و كەسی دی نا
زۆرزان بووم... ئەو دەمانەی
تۆ لە جێژوانیش نەبووی
من بەشوێن پێیەكانت سەبووریم دەهات
زۆرزان بووم... نەمزانی بەڕاستی باسی خۆشەویستیت بۆ بكەم
تۆش زۆرزان بووی ...
ئەو دەمانەی ئارەزووی ڕامووسانت دەكردم
باسی(ڕۆمیو و جۆلێت)ت بۆ دەكردم
تۆ زۆرزان بووی...
ئەو شەوانەی منت دەری لەخەوندا
سپێرە باسی خەوی ناخۆشت بۆ دەگێڕامەوە
تۆ زۆرزان بووی...
كە نەتهێشت شیعری دیكەت بۆ بڵێم
دەتزانی ڕۆژێك دێت لە قەسیرەیەكدا دەتشارمەوە
وەلێ تۆ نەفام بووی...
كە دەتتەوێ كوڕی خواپێداویش بزایێ بتلات بە شیعر
تۆ نەفام بووی...
واتزانی هەموو كوڕێ پەڕەی لێویت بۆ دەكاتەوە



بە ئارەزووی خۆت حەزەكانتی تیا بنەخشێنی
تۆ نەفام بووی...
چۆن منت نەكوشت بەر لەوەی بڕۆی...
ئەی نازانی هەموو قسیدەیەكم پۆرتریتێكی نوێی تۆ دەبێ
من و تۆ هەردوو نەفام بووین
من و تۆ هەردوو زۆرزان بووین
ئای... چ نەفامێكی نەفام و چ زۆرزانێكی هیچ نەزان بووین
ئێستاش پێم دەڵێن دۆڕاو...
ڕاستە هەموو شتێكم دۆڕان و عیشق نا
شیعرەكانم دۆڕان بە خانمێكی دڵبەردی عیشقنەزان
گوڵەكانم دۆڕان بە وەرزێكی چاو زەردی وەكو خەزان
وەرزێك هەناسەكانی لەعەدەمەوە و
نەسیمەكانی لە دۆزەخەوە و
ڕەنگەكانی لە بەهەشتەوە هاتبوون
دۆڕانم... نیگاكانم لە سیمای پەرییەكی سەرابیدا دۆڕان
گریانەكانم لەپرسەی مرووریەكی زیندوودا دۆڕان
چاوەڕوانیەكانم لە ڕێگای موسافیرێكدا دۆڕان
كە هەنووكە نەهات و..هەرنایات
هەموو شتێكم دۆڕان عیشق نا...
چونكە هێشتا عاشقێكی ڕاستی نیم
ئاخر بۆ كەس نەیزانی دۆڕانیش بردنەوەیەكی جوانە

ئەگەر هەر پایز وەرزی فیراقە
بۆ لە بەهاری عیشقا گەلاّ لقی وەفا جێدەهێڵێ
بۆچی گوڵێ لێو لە پەپولەی ماچ وون دەبێ و
وەنەوشەی حەزیش باخچەی هیوا جێدەهێڵێ
تەماشاکە ئەم سەفەرە پەیامێکە و مەرگی پێیە
مەرگێ بۆ من...
مرگێ بۆ گوڵ...
بۆ شیعر و حەز و ئارەزووش وا لەڕێیە

٢٠٠٤/٤/١٠

# دوایین سەفەر



من ئیدی خاڵی دەبمەوە لەوەفاو
بەپراخی نەفرەتیترین درۆی شاخدار
لەچیای یەئسمدا دەچەقێنم
هەڵدێم و هەموو دڵەکان تاریک دەکەم
پەپووە خوێن گەرمەکان بانگهێشت دەکەم
بۆ کۆنفرانسی عاشقە دۆڕاوەکان
هەڵدێم...
هەڵدێم و ئیدی بەتخوبی باخچەی گوڵەکانی عیشقدا گوزەر ناکەم
نەبادا تەوری چاوی ڕەقیبان
درەختی چرکە کریستاڵیەکانمان ببڕنەوە و
دارەمەیتی لێ دروست بکەن بۆ عیشق

زاهیدی تێزە بەدەستەکانیش
لەخوێنی قەراغ شۆستەکاندا دەدرەوشێتەوە
کە دوێ شەو
چەندین کەللە سەریان بەهەناسەیەک لەلاشەکان جوێ کردەوە
جوێ لەعیبادەتانەش
ڕۆژووی ڕقیان بەئاوی فرمێسکی ئەو گولانە دەشکێنن
کە شەوانە کێنیان لەسەر گیاجاڕەکان ئەتەک دەکەن
تینوێتی خەجاڵەتی چەقۆکانیان
بەتەهارەتی خوێنی ئێو مولولەکانی جەستەی عاشق دەشکێنن
بۆ پرسیارە پیرەکانی ئەم خەیاڵە گۆڕغەریبانەم
کام وەلامە هەرزەیە... فاتیحای کلۆمدانی دەرگای چەنەبازیم دەخوێنێت
ئەم پایزەش کاروان خۆی دەداتە دەم شەپۆلەکانی سەفەرەوە
لەزەرفێکی داخراودا پەیامی ئەو گولانە دەبات بەرەو غوربەت
کە بەدرێژایی ئاوێزان بوونی بەهار پەپولەیەک ماچی نەکردن
لەنەوارێکی خاڵیشدا
بەشی تێشووی تەمەنی نامۆیی خۆی
تف و جنێوی کچۆلە عیشقنەزانەکان ئەرشیف دەکات
لەسکێچێکی چکۆلەشدا
شێوەی سەدان جەللادی عیشقکوژ هاوسەنگ دەکات
بە پۆستاڵی سەربازێکی هەڵهاتوو لەجەنگ
لەگەڵ سەمای یەکەمین گەلا بەئاسمانا



سۆز دەکوژێت و بەئاڕاستەی (با)دا دەڕوات
نەفرەت لە بەختی بە خۆڵەمێش بووی خۆی دەکات
لەسەر دواهەمین کانی سەرسنووری نیشتمان
تف لەوێنە شێواوەکەی خۆی دەکات لە ناو ئاوە لێڵەکەداو
کۆڵە پشتەکەی شەتەک دەدات
چەند تنۆکێک فرمێسکی یاقوتی ڕۆدەکات
بۆ پەژموردەیی گولە بە جێماوەکان و
بۆ کاروانی مەرگی... لاوانی نیشتمانێکی لە قوڕگیراو
عەسرێ دەیڕوانیە گەمەی پەنجەکانی (با)
لەسەر سنگی سنەوبەرەکانی باخی گشتی
شەوێ لە چاوەڕوانی هەڵهاتنی هەسارەی شیعرێکدا
تا سپێدە لە کلاوڕۆژنەی ژوورکەیەوە
دەیڕوانیە ئاسمانی پڕ سۆزی خوا
لەگەڵ ڕوئیای دواهەمین قەسیدەدا
دواهەمین بڕیاری لە لافیتەیەکی سپیدا ئیعلان کردو
نووسی: (دواهەمین سەفەر)
بەدرێژایی بالای ڕوبارێک حەزەکانی خۆی هۆنیەوەو
لەشوشەیەکی داخراودا توڕی دایە سەر لمی بیابانێکی بێناونیشان
لە یاداشتنامەیەکدا بۆ سەرۆک نووسیبووی
ئەوە کێیە گەرەکیەتی ... چوون پاسای ڕاومان بکات...
وا دانی بۆ ڕۆکردووین

ئێمە داوەکان بەکلک دەتەقێنین و
دێوجامەش بۆ سەرکردەکان دەنێینەوە
ئەوە کێیە فرمێسکی تیمساحیمان بۆ دەڕێژێ
کە بەقەد مووی لەشی خۆی قینی لێمانە
ئێمە بەر لەسەفەر
ئیمزایەکی ساختەمان بۆ کردووە و هەر دەدۆڕێ
پەیامی سەرۆکیش
ڕێک تەریب بوو بەخەتاکانی ڕەهەندی تاوان و
بەمەکری ئەو ڕێوییەی
کلکی لەسەر شارە مێروولەیەک درێژ دەکات
کە نێچیری گیرنایێت
سەرۆک دەبێت بەموفتی و
فەتوای تەحریمی یاداشتەکانی دەردەکات و
خوێنی حەلاڵی ڕژان دەکات
ئەویش بێترس لەو دیو درکەزێلکانی سنوورەوە
چاو لەپیاوانی سەرۆک باز دەکاتەوە
دواتر لەیەکەمین وڵاتی غوربەت
لەلاپەڕەیەکی فاکسدا
تەلاقنامەیەک دەنێرێتەوە بۆ ژوورە تاریک و چۆڵەکەی و
دەڵێت:
ئیدی من نابمە زیندانی ئێو چوار لادیوارە زیوەکەت



نەفرەت لەو خەونە عاتفیانەی
کە لەتۆدا زیندە بەچاڵم کردن
نەفرەت لەو نامانەی
کە شەوان لە تۆدا دەمنووسینەوە
نەفرەت لە منیش کە بەدرێژایی ئەو ساڵانە
وەک تەواوی کەرەستە بێگیانەکانی دیکە تیاتدا ژیام
نەفرەت لەو کچەش
کە هەموو شەوێک خەیاڵە شێواوەکەی
دەبووە میوانێکی کاتیم تیاتدا
لێ بەرەوە و بڕوخێ
نەبادا کەسێکی دیکەش وەک من سیاچارە بکەیت
من ئێستا لەم غوربەتەدا
تینووی کانیاوی سۆزی ژنێکی سۆزانیم و
پەرۆشی تەفسیرێکی خۆمم
ئەو خۆمەی کە زۆر لەمێژە
خولیای ئاشنابوونیم و نایدۆزمەوە
دەیان جار لەنیشتمانی غەدرو درۆ
ئیعلانی دۆڕان و وونبوونی خۆمم کرد
کەس نەیبردمەوە و کەس نەیدۆزیمەوە
لەڕۆژنامەیەکدا لەوانەیە
دەیان سکێچ کێشرابێت بۆ ناسینەوەم

کەس نەیخوێندمەوەو کەس نەیبردمەوە
من ئیدی یاخی دەبم لەئامێزی دایکم و
لەسۆزی بێ سۆزی باوکم
هەر دەڕۆم و ماچ دەبارێنم بەسەر بەرد و زناری
ئەو کێوانە و ئاوو هەوای ئەم غوربەتە و
هەر لێم وەردەگرن
ئیدی گوێ بۆ نەواری خاڵی رادێرم و
لاپەڕەی سپی ناخوێنمەوە ..
بەپێنووسی بێ مەرەکەب نانووسم و
بەکپی بێ دڵ عاشق نابم
بەکەشتیەکی بێ چارۆکە... سەفەر دەکەم
سەفەر... دواهەمین سەفەر
بەبەلەمێکی بێ سەوڵ دەریاکان تەی ئەکەم
چاو دەبڕمە ئاسۆی شینی تێکەڵاوبووی دەریا و ئاسمان"
دواهەمین نیگا لەچاوانیدا خنکا
دواهەمین حەز بووە پەپولەی دەم(با)
یەکەمین رۆحی پێدەچێ دواهەمین فڕینی بێت
ئیدی ووشترشەپۆلێک لەدوورەوە
ئامێزی بۆ دەکاتەوە و
سەدایەک لەفەلەکەوە دێت و دەڵێت:
وەرەو لەوریو شەقامەکانی ئەبەدییەتەوە



لەتریفەی مانگ دەستنوێژێک بگرە بۆ ئاوێزان بوونی دەریا
دەریا راموسە و پێکەوە
لەکەژاوەی مەرگێکی ئەرخەوانیدا
ماچبارانی ئەو زەمەنانە بکەن
کە دەقیان بەخەمەوە گرتووە
لەگەڵ شەپۆلە نەشئە هێنەکانیدا
تا دوایین هەناسە
هاو لەحزەی تامەزرۆیی لێوەکانی دەریابە و
هەر لەدوور ڕا لەسەر سنگیەوە
پەیامی فەنابوون بەنەورەسێکدا بنێرە بۆ کەنارەکان
بەفریشتەی رۆحیشدا هەواڵێک بنێرە بۆ خامە چاو خوێنینەکان
تا حەیرانێک بەشادی تۆوە بچڕن
ئیدی تێشووەکەی کۆڵت
دەرخواردی ئەو بێچووە ماسیانە بدە
کە لەسەفەری راوچیەکاندا دایکیان کەوتە تۆڕەوە
دەریا ئاشنا بکە بەسۆز و
هەر پارچەیەک لەجەستەت
لەشەپۆلێکیدا ببەخشە بەقرشێکی پیر
کە حەوسەڵەی راوی نەماوە
سەفەر دەڕواو تۆی جێهێشت
بێخەم بنوو لەدڵی دەریاو

ونبە لەچاو نەورەسە عاشقەکانی ئەم مەملەکەتە ..
کاروان ڕۆیشت و دەریاش بەئارامی نووست
لەنیشتمانیش
هاوڕێیەک فرمێسک ڕۆدەکات و
پێنووسێک چیرۆک دەنووسێتەوە
چیرۆکێک لەسەرەتادا تەواو دەبێت و
پەیمانێک تیایدا دەڵێت:
پایزێکی دیکە منیش سەفەرێک دەبمە میوانت
منیش کاتژمێری دڵ دەخەمە ژێر بەرداشی قەدەرەوە و
بە کچە لەخۆباییەکانیش دەڵێم:
لەیەکەمین وەرزی عیشقدا
هەموو حەزەکانتان بڕۆژێنن بە شێتیەک
کە لەتخوبی جوانیدا سەماکانی
بەقەڵا ئەدا بکاتەوە
منیش ئێوەو نیشتمان خۆش

**ئەیلولی ٢٠٠١**

**ئەم شیعرە بۆ هاوڕێم (هونەر ئیبراهیم) نووسراوە ..**
**کە لە ئەیلولی ٢٠٠١ لە دەریای(ئیجە)دا وون بوو**

# دێڕێک بۆ تەریق بوونەوەی پەنجەکان



ویستم کلیلەکان بشارمەوە
تا لاوکی ماچەکان مەستتربین
بەڵام لەنزیکترین هەنگاوی پەنجەکانمدا
بۆنی تەریق بوونەیان گەیشتێ و
چرپەیەک لەهەناسەکانی دەریا
قفڵێکی دا لەدەنوکی پەنجەکانم
لەتەنیشتی راموسانی (با)وە
گەردەلولێک چرۆی حەزەکانی هەڵوەران
لەتەنیشتی شەڕی لێو و زمانەوە
تەزوویەک بوومە لەرزەی خستە جەستەمانەوە
دەمردین و هەموو جیهان نووستبوون

دەژیاین و هەموو جیهان مردبوون
کلیلێک دەرگای منداڵی کردەوە و
کلیلێک دەرگای لەئارەزوو داخست و
کلیلێک دەرگای بۆ ماچ والآ کرد
کلیلێک بانگی تێکئاڵانی دەکردین و
کلیلێک مەحکومی کردین بەلەزەت
کلیلێک دەرگای جودایی کردەوە و
دەرگایەک باوەشی بۆ جیهان کردەوە و... ئێمە نا
دەرگایەک دەستی جیهانی گرت بۆ لای ئێمە و
دەستی ئێمەش بۆ لای خەم
دەرگایەک خۆی پێوەدا لەشەڕی نیگا تورەکانی ئێمەدا
دەرگایەک خۆی پاککردەوە لەنوێنیەکانی ئێمە
ئێمەش خۆمان لەگوناهی لێوەکانمان خاڵی کردەوە
خۆمان دایە دەست لەئامێزگرتنە سارد وسڕەکانەوە
ئەو لەئامێزگرتنانەی خودامان تیا خۆش دەویست
دەرگامان تیا خۆش دەویست
کلیلمان تیا خۆش دەویست
پەنجەرەمان تیا خۆش دەویست
ئینجانەمان تیا خۆش دەویست و
خۆمان گوڵ بووین
شانۆمان تیا خۆش دەویست و



خۆمان سیناریۆ بووین
فریشتەمان تیا خۆش دەویست
کە دیاری ئاسمانی بۆ هێنابووین
ئاسمانمان خۆش دەویست
کە ئەستێرەی راموسانی بۆ دەرخستین
بیرمەو زۆر منداڵ بووم
تۆ منداڵی منت
بەگەمژەیی گەورەکان دەبینی
منیش دەگریام و
دەمگوت: منداڵم...منداڵ... منداڵێکی لاسار
دەڕژامە نێو پەنجەکانتەوەو
دەتپرژاندم بەسەر پرچ و گەردن و سینەتا
دەبووین بەدوو پەیکەری پێکەوە خولقاو
سەراپا دبووم بەتۆو... سەراپا لە من دەئاڵای
دەبووین بە دوو تنۆک شەونمی وێڵ بەسەر سەر و
سینەی یەکدا و
دەگەڕاینەوە بۆ عەدەمیەتی جیهان و
دەبوومە ئادەم و
دەبوویتە حەوا
هابیلی پەنجەکانم... قابیلی سینەتی دەترساند و
ئەهریمەنی بۆنەکانم... لەباخی پرچەکەت

هەزاران هێشوە نەشئەی پێدەرەزیم
بەهەشتێک لای تۆ هەبوو لەنزیک دۆزەخی من
هەزاران پەراسووی خۆتت دەرهێنابوو
تا زارۆکی عیشقێکی پێژوو بهێنینە بوون
بەماچە شووشەییەکانت گەورەت دەکرد و
بە بیرکردنەوە شێتانەکانم دەمفستە ئاویلکە
تۆ دەگریای بۆ پەژموردەیی گوڵەکانی غروب و
منیش کاڵفامانە دەستم دەبرد بۆ گوڵە حەرامەکانی تۆ
تۆ بەماچەکانت ڕێگای باخچەکانی عیشقت پێشان دەدام
منیش بەهەناسەکانم بۆ تەرمی حەزەکانی خۆم دەگەڕام
من دەمگووت: باخی سێوانە مینبەری عیشق و
تۆ دەتگووت: شیلەی لێوانە سەکۆی ئێمە
ئەدرەسەکانم وون کردبوو  و هەر دەگەڕام
چاوەکانت وەک ئاماژەنمایەک دەیبردمەوە بەردەم لێوت
دەگەیشتم بەهەموو تۆو دەگەیشتی بە هەموو من
تۆو من دوو بەندەی گومڕای خوداین
من و تۆ دوو مەخلوقی پڕ... پڕ گوناهین
دەبێت لەگەشتی تەهارەتا
باسی سروتەکانی ماچ بگێڕینەوە بۆ نەوەکان
دەبێت جیهان فێری گوناە بکەین
دەبێت ڕێگایەک بۆ بەزەندیق کردنی مرۆڤ پەیدا بکەین



تا لەبری باران هەر ماچ ببارێ...
تا لەبری گوللە ماچ بنێن بەیەکەوە
تا لەبری ژەهر ماچ دەرخواردی یەکدی بدەن
تا بۆ هەموو جیهان ئاشکرای کەین
شۆڕشێک وا بەڕێوەیە
لەیەکەم نیگای تۆوە دەست پێدەکات و
لەدوایین هەناسەی جووت بوونمان کۆتایی دێت
ئالاکەی گوڵێکەو
دروشمەکەی دوو دڵە
بەرنامەکەی...وڵاتێکی پڕ لەعیشقی تاهەتایی و
مەملەکەتێکی وێرانکراوە بەماچی عاشقەکان
کلیلەکان دابەش دەکەین
بۆ داخستنی دەرگا لەهەموو جیهان
بۆ وون بوون لەهەموو جیهان
بۆ گەیشتن بەدڵی هەموو جیهان
بۆ گەمە کردن بەعەقڵی فەریکی هەموو جیهان
لێناگەڕێین...تاتیغی ڕقی ڕەقیبان
ملی خۆمان و عیشقە ئاوییەکەمان
لەمەزادخانەی جوانیدا بەهەناسەیەک دەقرتێنن
لێناگەڕێین...تا جەلادیش فێرە عیشق نەبێ
تا چیاکانیش نەکەینە(عیشقستان) ... لێناگەڕێین

تا تفەنگ پەشیمان نەکەینەوە لەجەنگ
تا دڕک نەرم نەکەینەوە...لێناگەڕێین
تا هەموو پەنجەکان تەریق نەکەینەوە لەیاخی بوون... لێناگەڕێین
تا هەموو لێوەکان فێری ماچ نەکەین... لێناگەڕێین
تا خاچێک لەداری گوڵ بۆ جەللادر دروست نەکەین... لێناگەڕێین

٢٠٠٤/٦/١٦

# (زیندان)ی بوون



عیشق چ ئافاتێکە
کاتێ خەزانی دارەکانی ئاوەزوو وەفا دێت
مەرگ تا نزیکترین ئاقاری دڵ دێت
چرکەی هاتنی ئەو(با)یەی
کە گەڵاکانی موحیبەت و ئاوێزان بوون هەڵدەوەرێنێ
ئیدی دڵ ئولفەت دەگرێ بە گۆرانیە زەردەکانەوەو
هاوگینگڵ لەگەڵ شۆستە ساردەکانی شەوان
دەچێ بۆ چنینەوەی وەنەوشەی یادە سەوزەکان
ئارام... ئارام سیناریۆی یەئس هێنانی
راڤە دەکات بۆ سێبەرە نەخۆشەکەی خۆم
سێبەرەکەشم جارێ بەچاوی بەزەییەوە تێم ئەڕوانی و

جاریکیش بەچاوی بێهۆشێکی هیچ نەزان
لەژێر سەھەندی سنەوبەری لاڕێی شەقامەکان
جاریک ماچم ئەکا و جاریک تفم لێ دەکا
بەلأم من ھەر خۆشم ئەوێ و خۆشم ئەوێ
چونکە لەپیاسەی شەوانی ژێر تریفەی مانگ و
بەردەم بیلاجیکتۆری بارەکان و
بیابانەکانی ڕۆژ تەنھا ھەر ئەو شک ئەبەم پیاسەم لەگەڵ بکات ..
لەیەکەم سەرنجمەوە بۆ خاڵێکی وونی ئاسمان
ئەستێرەی ئەم عیشقە بەھەدەر چووەم بەدی کرد
بەلأم نەمدەزانی سەیلاوی قەدەر ئاسمانیش ئاوەژوو دەکات
جوانییەکان تاوانی سەمای سروشتن
حەزی منیش پەپولەی ئەندێشە و خەیاڵە
کە وابوو عیشق و خۆشەویستی فەراھەمی تاوانەکانی زەمەنن
من ھەرگیز ڕەنگی ئەو ماچەم لێنابێتەوە
کە بەیانیەک کچە سۆزانیەکەی کۆسمۆس بە پۆستا بۆی ناردم
ماچێک تامی کچێنی و تەھارەتی تیا نەمابوو
ماچێک دەنگی حەزو نەشئەی لێبڕابوو
من ھەرگیز خولیای ئەو ئاوێزان بوونەم لەسەر دەرناچێ
کە نیوەڕۆیەک ھات و پێکەوە رووت بووینەوە و لەسەفەری ئۆرگازم و نەشئە
لەنیوەی ڕێ بە مەئیوسی لەترسانا پاشا و پاش گەڕاینەوە
من ھەرگیز ئەو ئازارەم بیر ناچێتەوە



کە ئێوارەیەک خانمە (پەریسا)کەم بەفرمێسکی چاوەکانی و
بە تەڕوەندی ژیانە پڕ کەسەرەکەی خستیە جەستەم
من ھەرگیز لەزیندانی مانای بون تێناگەم
کەشەوێک سرووش بەنامەیەکی پۆست نەکراودا لەمابەینی
چەند دێڕێکدا تەقەتی کردبوو بۆم
کاتێ خوێنمەوە نووسرابوو
(ئەم پەیکەرانە چ رازێکیان لەدڵایە
وا بەبێ ھیوا لەسایەی ئەم چیخانە لەچاوەڕوانیدان
ئەی باڵندەکان
نوێنی کام تاوانە ئەدرکێنن
پاش گەڕانەوەیان لەم سەفەرە
چ حیکمەتێکی تیایە بەھارەکان ڕەنگیان نارنجی چۆوە
ھەورەکان ھەواڵی تاوانەکانمان بەبارانا بۆ دەنێرن
قەدەریش جەنازەی بەخت و چارەنووسمان پێ دەسپێرێ
ئێری لەکەلاوەکان و
لەپەنا دیواری کوختە نژیارەکانی ئەم مەملەکەتە شنیارە
زەماوەندی بە بەفر بوونی عیشق دەگێڕنەوە لەبری
چیرۆکی سادەی دانیشتوانی شارەکەم
پڕە لەستەمی کابووس ئاسای
داستانە سەیرەکانی عیشق و
بەسەرھاتی پاڵەوانانی چیا و

گۆرانی مەرگی گوڵە زەنبەقیەکانی جوانی و سرووشت
هەموو زەمەنی شادیم
رامووساتێکی عاشقانە بوو .. بڕایەوە
خەونە سادەکانی منیش شەفافترن لەقینی دڵی پەپولەکان ..
بەشی سەدان تەسبیح ئەستێرەی کشاوم ژمارد
کەچی تەمەنی درۆو زۆردار هەر درێژتر دەبێتەوە
بەشێ سێ دونیا مردنم بینی
کەچی نەمردن کۆتایی دێت و نەمەشر دێت
درەختەکان مەمکیان لەشنەبا فێنکەکانی بەهار دەشارنەوە
بەڵام لەبەردەم رەشەبا شەهوانییەکانی زستان بەڕووتی رادەوەستن
بەخشش و دیاری بۆ زۆردارەکانە و
خۆزگەو حەزێکی نەبڕاوەی بێئومێدیش لەئاوزێڵی
دڵی کاسۆکان پەنگی خواردۆتەوە
نەدێتە دی نەفەرامۆش دەکرێت
پەیکەرەکان هاتنە گۆ
باسی چاوەڕوانی ئانیان دەکرد
باڵندەکان گەڕانەوە
سەربڕینی عیشقیان درکاند
حیکمەتی نارنجی بوونی بەهارەکان
لەداخ و حەسرەتی ئەو گوڵانە بوو تفیان لەسەوزی دەکرد
قەدەری هەورە ویلکەش



هەواڵی نامۆ بوونی ئێمەی پێبوو
بەخاکی خۆمان و بەژیان)
شەرابی ئازارێکم فڕ کردووە
خۆم لێ وون بووە وەک ئەفیون کراو
مەستی عیشقێکی زەمهەریری داوییە لەسەرم
بۆیە لەهەموو گۆشەیەک بەهەڵکورماوی دەبینرێم
تەمەنم هەمووی بەم مەستیەوە دەبەمە سەر
تا کەسێ نەبێ پێم بڵێ هۆشیارە
دوا پەڕەی سرووش نامەیەک لێی نووسرابوو
(دوای نووسینەوەی ئەم شیعرە وەرەوە
غەریبیت دەکەم وەرەوە
کات نەما بۆ چاوەڕوانی ئەی عاشقە پەرۆشەکەم)

**٢٠٠١/٧/٢٥**

**ئەم شیعرە لە یەکەمین فێستیڤاڵی ئەدەبی لاوان .. لە هۆڵی(دیالۆگ)ی شاری سلێمانیدا ساڵی ٢٠٠٢ خوێندراوەتەوە**

# گوێم لەشەقەی باڵی خەمە



گوێم لەشەقەی باڵی خەمە پۆل ..پۆل دەفڕن
ئەو دەمانەی قۆزاخەی ئازارەکانمان
دەکەین بە پەپولەی ماچی فڕیو
گوێم لەفوارەی لەزەتە
ئەو چرکانەی پەنجە تینوەکانی من
ئاوی حەزی پەنجەی ئاوریشمینی تۆ دەخۆنەوە
گوێم لە گۆرانی ژیانە
ئەو ساتانەی لێومان بەشی هەموو جیهان
ماچبارانی یەکدی دەکەن
وەرەو جارێکی دی باوەشێکم پیادا بکەو بمەرەوە
من لەنەفرینکراوەکانی پاکیم
لەفڕیدراوەکانی زادەی عیشقم

هەموو ماچەکانم بێژوون
سروودێکم لەبەر نیە جاویدانی حەزەکانم بگێڕمەوە
ئێوارەیەکی سەرسەریم ..
بەیانیەکی تەنیام ..
نیوەڕۆیەکی بێ حەوسەڵەم ..
بۆ ڕنینەوەی بەری ماچەکانم دەڕوانمە ئاوێنەکەم
بۆ ئەرشیف کردنی خونچەی ماچەکانی تۆ
بیر لەسۆزی خودا دەکەمەوە ..
خەڵوەتێکی ئاوارە دەکێشم
بازنەیەکی لارو خوارم بەدەوروبەری خۆمدا کێشراوم
دەفێکی شەهیدم لەزیکری تۆدا دەژێمەوە
هەموو وەرزێک لەچاوەڕوانی باراندام
چونکە لەبۆنی ماچەکانی تۆ دەچێت
هەموو چرکەیەک بیر لەهەنسکی پەپولەیەکی گریاو دەکەمەوە
کە لەدەنگی هەناسە قوڵەکانی تۆ دەچن ..
ئای دڵی من
خۆ بەبێ پرس دڵت بردم
خۆ بەبێ ترس عیشقت بڕی پڕ بە باڵام
بەبێ منیش
ماچە ئاوییەکانت دەبارێنی
تەماشای ئەو پەیکەرانە بکە
کە ساڵانێکە باوەشیان کردووە بەیەکدا



لەحەزی ئێوارە نارنجیەکانی ئێمە دەچێت
پەنجەم ختوکەی دەدایت و تۆ خۆت پێنەدەگیرا
زمانت ختوکەی ڕۆحی دەدام و خۆم ڕادەگرت
وونت کردم لەبێشەی پرچە شێواوەکەتدا و
بەشی شەوێک نەشئەت نەدامێ بەدیاری
شەلاڵی بۆنی باخچەی سینەت کردم و
بەشی پێنج پەنجە سێوت نەدامێ بۆ یاری
بەشیلەی لێوەکانت ئاگری ناخمت گردایەوە
بەنیگا نەرمەکانت داستانی چرکە سوورەکانت بۆ گێڕامەوە
ئەو پەنجە یاقوتیانەی چارۆکەی کەشتی حەزیان کردەوە
ئەو هەنگاوە شێتانەی گەیاندرتی بەمن
سیناریۆی مەرگمان جوانتر دەکەن
بەردەستی جەلادەکانی خێڵ ..
گوێت لەنیگام بوو بانگی دەکردی و
خومارانە خۆت گەیاندە چڵی ئارەزووم
وەکو لاولاو لەیەک ئالاین
تۆ منت دەگوشی و منیش ماچبارانم دەکردی
زۆرت کرد بگەیتە دڵم و
دەرگاکەم کلیل درابوو
جەستەمان وەک دوو جەمسەری باکور و باشور
هەر نزیکتر دەبوونەوە لەیەک و
هەر بەرامەی لەزەتمان لەیەک دەخواردەوە

بیرمە و هێشتا لەبەرچاومە
چاوەکانت وەک سەرخۆشێکی پەشیمان
خاو... خاو هەڵدەبڕین و
دەتوت: دواین ماچە و دەڕۆمەوە
دەستەکانت هێدی.. هێدی شل دەبوونەوە لەگەردنم و
جارێکی دی توند باوەشت پیا کردمەوە
دەتوت: دەمەوێ لەسەر سنگت بمرم ..
نەدەمردی و...
نەدەژیایتەوەش
لەسەر سنگم خەوێکی شێت
خەریک بوو بتات بۆ مردن
ترپەی دڵی ترسنۆکم
رایپەناندی و
ئەمجاریان بەڕاستی رۆیشتیەوە
شوێنی چرنوکی هەردوو دەستت
بەسەر سنگمەوە مانەوە و
تاکو ئێستاش دەسووتێتەوە

٢٠٠٤/٤/٢٣

# قەسیدەیەک لە ڕەنگی چاوت



من چی بکەم کە هێشتا هەر عاشقی تۆم
کە هێشتا وەک منداڵیم وڕکم بە تۆوە گرتووەو
هیچ دایکێک ناتوانێ تۆم بۆ بخاتە نێو دەستەکانمەوە ..
تۆ کە دڵبەردترین کچی ئەو سەر زەمینە بیت
من دەتوانم چیدی بکەم .. تا تۆ بگەیەنمە
بەر دەرگای ماڵی عیشقە چیاییەکەم
تۆ لە دەنگی درۆکانی منەوە
فێری ئەلف و بێی عیشق دەبوویت و
منیش لە ڕەنگی چاوەکانی تۆوە
تەلیسمی عیشقێک گرتوومی
کە ئیدی خۆشم بۆ نادۆزرێتەوە ..
دەمزانی و شیعرەکانم شاهیدن
کە تۆ دەمکوژیت و

ڕۆحم بەسەر جەستە بێ خاوەنەکەمەوە جێدەهێڵی ..
نەتزانی و شیعرەکانم شاهیدن
کە من بە مردنیش
ڕەنگی ئەم عیشقەی تۆم لێنابیتەوە ..
دەڕۆیت و هەمیشە نزیکتر دەبیتەوە
وا دەزانی هەنگاوەکانیشت وەکو دڵت
ئارەزووی دووری منیانە ..
نا .. ئەی خانمە بێ میهرەکە
کە بە دووی شوێن پێیەکانت دەگەڕێم
لە کۆلانێک لەو دیو ماڵی خەمەکانمەوە دەتبینمەوە ..
کە کەشکۆڵی سەفەرە بێ هەناسەکەت دەکەمەوە
تەمی دەیان قەسیدەی سەرپڕاوی من
بەسەر دەستە ماکیاجەکەت و
لە نێو دەستەسڕەکەتەدا دەبینمەوە ..
شیعرم گوڵی باخی عاشقان بوو
بۆم دەچنیت و
لە بەرۆکی هەموو چرکە فیلاوییەکانتم دەدا..
هەناسەم واز کردبوو
بۆ بەرامەی شکۆفەی عیشقت
نە بارانێکت هاتە حزوری بیابانی دڵم و
نە نەسیمێکت پشکۆی حەزی گەش کردمەوە ..
تووڕەم لە خۆم و پێنووسە هەتیوەکەم



لەو دەمەوە کە کەس نیە
من شیعرێکی تەڕ و ئاڵی بۆ بنووسم ..
تووڕەم لە هەموو ڕەنگەکان
کە هیچ لەوان نەیانتوانی
من و تۆ بکەن بە تابلۆیەکی شێتانە و
ئاوێتە بین تا هەتایە ..
دەڕۆمەوە بۆ حزوری پۆرتریتی یەکەمین ماچ
تا سڵێپی داوای ماچێکی نوێ بکێشم ..
لە ئامێزی سۆزانیترین واهیمەدا
خەونی گەورە بوونی حەزەکانم دەکەمە ڕاست ..
ئەی خانمە دڵبەردەکە ..
تۆ دەتەوێ بڕۆی .. هەر بڕۆیت و
چیدی من نەبینیتەوە
کەچی بۆ هەر شارێک دەچیت
لەو دیوی چیاکانەوە
چرای ژوورە چۆڵەکەی من
خەوزڕت دەکات هەموو شەو
گەر بێزاری و پەشیمانی کە نەتکوشتم
ئەمجارەیان تۆ وەرەوە و ..
بە ماچێکی قوڵی پڕ حەز بمخنکێنە .. بمخنکێنە
تا دونیا فێری کوشتنێکی تازە بێ ..
فێریان بکە مردنێک هەیە و

لە ژیان جوانترە ..

فێریان بکە

دەشێ کەسێك بە تەنها ماچێکت بمرێ ..

ئای چەند تینووی ئەو مردنەم ..

دەمێك دەمویست لە شیعرێکدا جێت کەمەوە

هەموو شیعرەکانم لە تۆدا ون دەبوون ..

دەمویست دێڕێك بڵێم

پڕ بە باڵای حەزێکت بێت ..

کەچی پیتێکت پڕ بە باڵای تەمەن بوو

ڕەنگم لە هەموو پیتی دونیا دەدزی

تا تابلۆی جوانترین شیعرت بۆ بکێشم

نەغمەم لە خەمگینترین کەناری قەرز دەکرد

تا پڕ سۆزترین ئاوازت بۆ بکەم بە شیعر ..

ئەمێستا هیچ ڕەنگێك ڕەنگی نەماوە وەکو جاران

هەر بۆیە بۆ سیمای ئەم شیعرە ناوادەیەم

خۆم داوەتە بەر

شەستەی نیگا سیمراویەکانی

ناو وێنە زۆر زۆر نامۆکەت و

ئەلبومەکەم خەڵتانی خەمێکی قەترانی کردووە

٢٠٠٤/٩/٢

# کراوەترین دەرگا



دەرگایەکم هەیە کراوە بۆ(با)
تەنها بای سەبا نا هەموو بایەک
کراوە بۆ تیشک
تەنها تیشکی خۆر نا
هەموو تیشکێک
کراوە بۆ ماچ
تەنها ماچی کچ نا ماچی هەموو شتەکان
دەرگای ژوورەکەی من نەرمە
لە دەرگای ژوورەکەی باوکم ناچێت
لە دەرگای ژوورەکەی(پەریسا)یش ناچێت
دەرگای ژوورەکەم لە خێڵی ئاوریشمەو کاتی خۆی
لە گەڕەکی منداڵیم

ئەنکم زۆری خۆش دەویست
تەنانەت کە خەویشی دەبینی
دەرگاکەی منی دابوو بە خۆیدا بۆ نووستن
دایکم دەیگوت:
ئەمە دیاری باپیرت بوو بۆ باوکت
کە منی خواست
کەچی ئێستا باوکم گاڵتە بەدەرگای ژوورەکەم دەکات
چونکە پیر بووەو داناخرێت
دەرگاکەم نابینا بووە
دۆست و دوژمن لێکناکاتەوە
هەر کامیان بێن
دەڵێت : .. بەخێر بێن
زۆر جاران باوکم دەڵێت:
تۆ شێتی چۆن دەبێ دەرگا ئەوەندە میهرەبان بێت
براکەشم هەر وا دەڵێت
خوشکە گەورەکەشم
ئەوان نازانن ئەو دەرگایە
لە دەرگای دڵم دەچێت
بۆیە زۆر زۆرم خۆش دەوێت
دەرگاکەم نە دادەخرێت و
نەدەکرێتەوە



کەچی هەموو کەسێك لێوەی دێت و دەچێ
بیرم چوو ژوورەکەم دەرگای نیە ..

٢٠٠٤/٢/١٩-١٨

# رەجمکراوترین کچی سەرزەمین



لەنێوان دوو ووشەدا
من و تۆ مەحکومین بەنەفرەتی ئەوان
لەنێوان دوو هەناسەدا
جێی رقی هەموو جیهان دەکەینەوە
تۆ رەجمکراوترین کچی سەر ئەم زەمینەی
منیش کوژراوترین کوڕی ئاسمان
تۆ لە مندا هەموو گوناهەکان کۆ دەکەیتەوە و
منیش لەتۆدا هەموو تەوبەکانم دەکەم
باوەڕ دێنم بە ئاینی عیشق و
شایەتمانی مردن لەسەر دەستی تۆ دێنم...
تۆ خانەقایەکی پڕ لەدەرگای داخراویت
ڕێگە نادەیت

مەزڵومترین بەندەش لەتۆدا
تەوبەکان بگەیەنێتە ئاسمان...
من و تۆ نزاکانمان لەتەنیشت
زنارەکانی چیای ماچەوە فڕێدا
خۆمان خاڵی کردەوە لەبوونی سەر ئەم زەمینە خوێناوییە
لەدەرگایەکەوە
چووینە ئێو بەهەشتی پێکەوە مەست بوون و
بەکلیلی نیگاکانمان دەرگای چاوی هەموو دونیامان داخست
بەحەیرانێک مەست بووین
کەس گوێی لەئاوازەکانی نەبوو
کەس نازانێ چ تارێک و
چ عودێک و
چ دەفێک و
چ شمشاڵێک
لەزیکری ئێمەدا
ئاوازەکانیان
پەرێشان کردبووەوە بە سەر شانی ئێوارەیەکی نارنجیدا
کەس گوێی لەچرپەی هەناسەکانمان نەبوو
کە لەجوتبوونی پەنجەکانمان
قەفەسێکمان بۆ دیلکردنی
عەقڵە بەسەرچووەکان چێکرد



کەچی هەموو جیهان ئێمەیان لەتەفسیری
ئایەتەکانی تاواندا جێ کردەوەو
بەختورەکانی دڵی پیاوێکی رەش
ئیجتیهادی گلاوبوونی ئێمەیان کرد
فەتوای سوتانی نیگاکانمان و
برینی پرچی هەناسەکانمان و
لەقوڕگرتنی کۆشکی عیشقە خاکسارییەکەمان و
لەسێدارەدانی نامە رووتەکانمانیان دا
تۆ لەنێوانی من و دونیا
عەقیدەیەکی دوو دیو دەبینی ..
منێک موڵکی خودام و دەگەڕێمەوە بۆ خودا و
موڵکی تۆ و دەبێ بگەڕێمەوە بۆ تۆ
منیش لەنێوانی تۆ و خۆمدا
تەرمی حەقیقەتی خۆم دەبینم
حەقیقەتێک کە لەواهیمەی ماچەکانمان دەچێت و
لەماچی واهیمەکانمان دەچێت
لەنێوان ئەوان و ئەواندا
مەرگی عەقڵی هەموویان دەبینم
ئای لەسادەیی چاوە پڕ گومانەکان و
لەسەر لێشێواوی ئەو مرۆڤانەی
بەشی گوێیەک حەرفی موستەقیمان نەوتووە

بەشی شەوێك خۆیان خۆش نەویستووە ..
خوایان خۆش نەویستووە
بەشی پێکەنینێك دڵیان پاك نەکردووەتەوە...
لەمەملەکەتی جەللادەکان
مەرگ جوانترین هونەرە
دیوەخانی بێشەرەفەکان مەزادخانەی مرۆڤە
لەکۆشکی زەبەلاحترین پەیکەر
وێنەی روتترین کچی دونیا هەڵدەواسرێ
لەتەکیەی پیاوەکانی تەریقەت
پۆرتریتی شۆختترین کچە کافرۆشی تیایە
کەچی لەدیواری ئەم دڵە بێ دڵەی مندا
کە تارمایی وێنەکەی تۆ دەردەکەوێ
کۆتکراوەکانی خێڵ
کەرەنای رۆژی حەشریان گوێ لێدەبێ ..
گیرفانەکانیان پڕ کردووە لەدارِشتنی نامەکانی دڵداری
کەچی تەکفیری پاکترین عیشقی ئێمە دەکەن
دڵیان پڕە لەزەندیقی
کەچی بەناوی موفتیەکانەوە قسە دەکەن
تۆ لەمندای... منیش لەتۆدا
ئەوان لەرِقدان و... رقیش لەواندایە
من هەموو ماچەکانم لەوشەیەکدا جێ دەکەمەوەو



خامەکەم تاوانبارە
ئەوان هەموو ناحەزیان لەجوانی من و تۆدا دەتەقێتەوە
من و تۆ دوو بەندەی نابەڵەدی خوداین
بەهەڵە هاتووین بۆ ئەم بوونە نەبووە
من و تۆ دوو پەپولەی سەرلێشواوی بەهاری عیشقین و
رەشەبای ژان لێرە فرِێی داین ..
تۆ کچێکی پڕ پڕ لەسۆزی و
من کورێکی لێوان لێو لەدرۆ
من دێوانەترین عاشقی ئەم سەدەیەم و
تۆش پەروانەترین مەعشوقی ئەم هەوارەی
من و تۆ داستانێکی تازەمان پێیە
رەنگە بەشی هەموو گوێ ئاگردانەکانی ئەم شارە بکات...
من و تۆ لەهەموو سەری ساتێکدا
تورەکەی ماچەکانمان دێنین و
دەکەوینە بەشینەوەی
تا جیهان بەبۆنی عیشقمان بخنکێ
تا بمرن و لەدونیای بێ عیشقدا نەمێنن...
تا زیندوو ببنەوەو لەعیشقدا جارێکی دی زوبانیان بپژێ
دەمرین و بێ ئاگا لەخەونە کریستاڵیەکانمان
سوژدە بۆ تەریق بوونەوەی لێوەکانمان دەبەین
وسڵی عاشق بوونمان بە قامچی

موبارەکترین رقی جەللادە عیشق کوژەکان دەردەکەن
دەمرین و بەری ئەم رەجمە ناگرین
دەڕۆین و کۆلێک ماچی نەکراومان
شاباشی ئەم هەرەسە دەکەین
دەبین بەئاسمان و
بەسەر سەری هەموو بەندەکانی
ولاّتی عیشقەوە شین...شین دەکەینەوە...
دەبین بە هەڵم و
لەبێ بارانترین خاکی بێ دڵەکاندا ماچەکانمان دەبارێنین...
دەڕۆینەوە حزوری یەکەمین
ئێوارەی قەسیدەکانی دەستبازی و
دوایین جگەرەی ئەم بەختە بێ بەختە دەدەین بەبادا...
دەگەینەوە بەردەم دەهلیزەکانی روانین و
یەکەمین نیگا بەقەلاّ ئەدا دەکەینەوە...
دەبینەوە بەو دوو کۆترە شینەی
بەشی هەموو ماچەکانمان گمە گمیان بوو
بەشی هەموو هەناسەکانمان
لەنیوەڕۆیەکی حوزەیراندا
چۆڕانە سەر سنگ و لێوی یەکدا...
دەبینەوە بەو پەڵە هەورەی
نەسیمێک کردی بەدوو لەتەوە



بەشی ماچێکی باری و
بەشی فرمێسکێکی مایەوە بۆ ئێستا...
پەلی هەرچی فرمێسکە دەیگرین بۆ بەخەنەبوون
لێوی هەرچی تورەبوونە دەیمژین
تا لەبێ ئاگایی خەونە زرەکانی پیاوانی
هەرێمی گێلێتی
خەجاڵەتی بۆ قوتابخانەی فەلسەفەی ئەم ژینە بچنینەوە...
دەمێکی دی بێنە بۆ ماچێ
دەمێکی دی بێنە بۆ حەرفێ
دەمێکی دی دێت بۆ مرۆڤ بوون
دەمێکی دی دێت بۆ مردنێکی قەرسیلی
دەمەکان کورتن... کورت
دەمەکان بەدن... بەد...
دەردی تۆ
لەدەردی گەمژەیی من دەچێت
دەردی من
لەدەردی ناهۆشیاری تۆ ..
تۆ لەمندا هەموو شتێکی
هەروەکو چۆن لەنەزانیندا هەموو شتێکی
من لەتۆدا هیچ شتێک نیم
هەر وەکو چۆن لەزانیندا هیچ شتێک نیم

بەر لەمردنت
من دەکوژیت و بەتەنافی ماچێکدا هەڵمدەواسی
بەر لەژیانەوەم
تۆ دەژێنمەوەو لەتەنافی ماچێکدا هەڵتدەخەم
لەلێوی منەوە نەشئەی خەمەکان دەتگرێ و
لەلێوی تۆوە خەمی نەشئەکان دەمگرێ
ئەم جارەیان تەریقەت لە (حاشام)ێکەوە وەردەگرم
تا ببمە رەگەزپەرستێکی نەتەوەی عاشقان
تا لەسەهۆڵبەندانی ئەم رەقییانەدا
رۆژەخێک بم بۆ سڕینەوەی وشەی جەللاد
بۆ بەرەو عەدەم ناردنەوەی خەونی جەللاد
بۆ بەعاشق کردنی دڵی جەللاد
بۆ بە ئاو کردنی وشەکانی جەللاد ..
لەمینبەری ئەم تاعونەوە
فەتوای دوایین هێڵنجی گەمژەکان دەدەم
دوایین ماچم لەخاچێکی شەرمەزار دەدەم و
ئیدی تەوبە دەکەم لەئیمان...
تەوبە لەئیماندارە درۆزنەکان دەکەم
لەئایینی بێ ئایینەکان
لەپەیکەری پەیکەرسازەکان
پاچێکیش بۆ تۆ دەهێنم و



هەردووکمان بشکێنە
منیش دەچمە نێو مەنجەنیقی ئەم وڕێنەیەوە
کە من و تۆ دەکات بە دووان و
داهۆڵترین پیاو لەم قەرسیلی عیشقە
دەیانەوێ ڕاوی فرینەکانمان بکەن
وەلێ دەبمە ئەم چۆلەکەیەی دوایین دەنووکی
پاش تێربوون
دەدا لەکەللە سەریان و
بەخوایان دەسپێرم...
لەنزیکترین وێستگەی فڕیودراندا
لەگوزەرێکی پڕ جمەدا
پێدەکەنم بە بەربەرییەتی ئەو رۆبۆتانە و...
بە قاقا قوڵەکانی ئەو درنجانە...
بە قفڵی وشە
دەمی گەنیویان دادەخەم
بە پەیژەی ئێوارەیەکی پیردا
ئەم سکاڵایە سەردەخەم
بۆ لای خودای هەردوو جیهان
خودای هەموو مرۆڤەکان
خودای پاکردنەوەی ئێمە
خودای ژیانی ئێمە .. خودای مردنی ئێمە ..

لە لێواری یەکەمین گۆڕی بیابانە سۆزانیەکان
بەدوایین ڕۆندکی سوێرم
بۆ پەژموردەبوونی گوڵەکانی تەهارەت
دڵی گەرمترین(لەم) دەخنکێنم
دەیخنکێنم تا دەخنکێم
کە هەناسەمان هێندە تۆزاوی و پیس بێت
هەر دەبێ بخنکێین و... بخنکێین

٢٠٠٤/٧/٤

# ماچەکانی ئاو



ئێستا باران نوستووە
وەک من ناتوانێ
ماچەکانی ئاو لە مەستی چاوی
گوڵە هەنارەکانەوە ببینێ ..
چۆن لە سەمای گیاجاڕەکان تێبگەم
کە حیکمەتی لە ئامێز گرتنی ئاونگەکانیم لا پەنهان بێت ..
پەپولەیەک بە پرتەی باڵەکانی
باوەشێنی شکۆفتنی گوڵە هەناری عیشقێکی دەکرد
شکۆفە بوو بە نورو
شەوەزەنگی ئاوێزان بوونی هەڵاڵەی بۆ روون بووەوە
کاتی سەفەری دەستەکانم هاتووە
بۆ باخەکانی هەنار

کاتێ ئەوەش هاتووە نیگاکانم
تا دوا ڕەنگیان
لە سیمای جوانێکدا کاڵ بکەنەوە
کاتێ مەلەی لێوەکانیشم نزیک بووەتەوە
لە دەریای ماچە قوڵەکان ..
ئەمشەو شیعر
ئەسپێکە سەرکێش
گوڵێکە سوور
باخچەیەکە سەوز
ئاسمانێکە شین ..
لە خەلوەتی زیکری ئاوارەی عیشقدا
موردێکم شێت و هەڵوەدا
میوانێکم نابوور و ناوەخت
لە بێشەی عیشقگەرییدا
پرتەقاڵێکم ئافتابزەدە
مەگەر ڕێبوارە وێڵ و برسیەکان
ئیشتیهای خواردنم بکەن ..!!
ساڵانی زوو
لە شاباشای جەستە بەفرینەکاندا
چەترم هەڵدەدا
ئەمێستا لمی کەناری دەریاکانیش دەگەڕێم



بۆ شوێن(پێ)ی تازە
ئیدی پەنجە شێتەکانم
تابلۆیەکی ژیرانە ناکێشن
نەبادا خەونی کەنارییەکانیش
وەک حەزە تەڕەکانی من زەردچێتەوە
کێ لە زمانی ترس دەزانێت
با وەڵامی پرسیارەکانی بێ دەنگی بداتەوە ..
(ئاو) بە ماچەکانی
پەیکەری ئێمەی ئەفراند
کەچی کەس نازانێت ماڵی ماچەکانی ئاو لە کوێیە
لە نێوان(ئاو)و (بێ دەنگی)دا
گوڵێک هەیە ڕەنگی لە ماچ دەچێت
هەر کەسێ مەیتەری ئەسپەکانی هەور بناسێت
بۆنێکی ئەو گوڵەی بۆ دێت بە دیاری
ئیدی کاتێ ئەوەش هات
لە دوای فڕینی ڕەنگی ماچەکانی ئاوەوە
نیگاکان بمەیێن
بۆ بینینی ئەو دیمەنانەی هەرگیز دروست نابن

٤-٥/٤/٢٠٠٢






بۆ هەر کوێ بڕۆی
هەنگاو دەتوێنێتەوە بۆ لای من
روو لەهەر لایەک بکەیت
دەگەڕێیتەوە
تەنیشت دڵی من
ئەی دڵی من
دڵی منماڵێکە رووخاو
کاروانسەرایەکە چۆڵ
کۆشکێکە ردێن سپی
دەشتێکە بێفاوەن
جەنگەڵێکە چڕ ..
بۆیە هەموو کەس لەمندا وون دەبێت و

هەموو کەسێکیش تاپۆی منی لەلایە

دەڕۆی...؟

بیرت نەچێت کە دێتەوە سڵاو مەکە

چونکە دەزانم هەرچەندە دوورتربی لێم

زیاتر لەمن نزیک دەبیتەوە

برۆ با خۆر زویر نەبێت

برۆ با مانگ شەرم نەکات لەهەڵهاتن

برۆ با گوڵیش رووی هەبێت سەما بکات ..

ئەمێستا من لەنێوانی خۆم و خۆتا

کێوێک لەووشە ساز ئەکەم

لەنێوانی عیشق و ماچا وێنەیەک بۆ وەفا دەکەم

چیرۆکێک بۆ پایزەکەمان دەگێڕمەوە

تا مەست بیێ بەبۆنی دوکەڵی حەزمان

رۆمانێک بۆ شیعرەکانمان دەخوێنمەوە

تا شێتتر بێت سرووشە یاخیەکانیان ..

قەسیدەیەک بۆ ماڵئاوابییەکان دەنووسمەوە

تا وەک ئێمە ئێواران وێڵی دەستی نەستی خۆی بێت و بڕوا ..

ئەی دڵی من

خۆ دڵی من کەسیێ نیە خاوەنی بێت

کەسیێ نیە تیری ئازاری لێنەگرێت

من دەزانم هەموو شەویێ تۆ گوڵ دەچنی



تا سپێدە بەدیاریان بوێنی بۆم

من دەزانم تۆش وەکو من

بەستەی عیشق دڵی کردووی بەوێرانە...

ئاوازەکانی ئازارت لەبەر کردووە و

دەیڵێیتەوە خەمناکانە ..

بیرت نەچێ تۆ نازانی

دڵی شێتم مەستی ماچی نسارێکە

شەیدای پیاسەی بێمەنزڵی شەوگارێکە

خولیای خەوی نێو پێخەوی دەشتی سەوزە

تۆ نازانی

منی دۆڕاو شیعر بۆ دۆڕانم دەڵێم

منی زەنریق بەئاگری عیشقێکی بێڕەنگ سوتاوم

منی پەپولە تەنها هەلاڵەی وشە ئەمژم

دەوەرەوە

ئیدی ئەوە ئێوارەیەو

من ئاوازیێ بۆ دوورکەوتنەوەمان دەچڕم

ئێوارەیەو ئیدی دەبێ بکەوینە شەڕ لەگەڵ شەو

شەو ئێمە بکوژێت و

رۆژ رزگارمان بکات دەمێ

دەمێ رۆژیش لەپێکێکی پڕ لەیەئسا فرمان بکات

وەرە ئەی دڵە شووشەکە

بڕوانە لەحەزە بەردینەکانی دڵم
نەکەی دەستی ناسکی خۆت
بۆ ئاگری بێئامانی حەزم بێنی ..
نەکەی پەڕەی گوڵی ماچت
بە هەناسەی خەزان ئاسام بوەرێنی ..
تۆ بڕوانە لەو پایزەی جێم ناهێڵێ
دەزانێ چیرۆکێکم پێیە ڕەنگ زەرد...
دەزانێ دیمەنی ناحەزی من
وەختە کچێک دەڕفێنێ
بەرەو دڵێک نەرم وەک بەرد

٢٠٠٢/٥/١

# مردنێکی لەسەر خۆ



باخچەیەک بەر لەوەی بفرێت باسی نیشتنەوەی دەکرد
باڵندەیەک بەر لەوەی بکەوێتە داوەوە
باسی حەسرەتی قەفەسی دەکرد
سپێرەیەک گوێم لەئەستێرەیەک بوو
گلەیی لەخۆر دەکرد و
باسی ئەو دەمانەی دەکرد
خۆر شەهوانیانە لەو دیوی زەمینەوە
بەتیشکەکانی گەمەی بەسنگە فەریکەکانی کردووە ..
بە سێبەری پەیژەی فیرعەونێک
بۆ خەیاڵی سەر هەرەم سەرکەوتم
لەوێندەر لەتابوتێکی ئاڵتونیدا
خۆمم بینی بە مۆمیاکراوی

لەو عەدەمیەتی سۆزە کتێبی مێژووی خۆمم خوێندەوە
وێنەی هەموو کچە پاکیزەکانی سەردەمی منی تیا بوو
باسی تەهارەتی فیرعەونێک
کە هەرەمەکانی ئاوەژوو دەکرد بۆ خۆشنوودی
کچۆڵەیەکی عیشوەداری عیشقنەزان
باسی گریانی نەورەسێکی تیابوو کە دواجار
مەعشوقەکەی وابەستەی فیرعەونێکی بەسۆزی
تەنیای کەنارەکانی بێهودەیی دەبێت ..
چاوم بڕیوەتە ئاسۆو
لەئاسمانێک دەگەڕێم
بەشی نیگاکانم بکات تا خۆرئاوا
لەشەوێک دەگەڕێم
بەشی سەرنجم بکات ئەستێرەکانی
چەتری چاوەڕوانیم لەپەڕەی گوڵە و
بۆنی مەرگێکی ناوادە کاسی کردووم
بیر لەخۆکوشتن ناکەمەوە
دەزانم دڵم بووە بەشووشەیەکی درزبردوو
ڕۆژێک دێت تا دوایین تنۆکی حەزەکانی
دەچۆڕێتە سەر لمی بیابان
بیرمە ئەو دەمەی من ڕاوم نەدەزانی
تۆ کەوتیتە قەفەسی دڵمەوە



داوای ئازادی دەکەیت..؟
بڕۆ ئازاد بە لەقەفەسی نیگاکانم
بەڵام قەفەسی دڵم خۆت دەرگاوانییت
نێزەی ووشە بەردینەکانت
هێشتا وا لەپەڕەی دڵما برین قولٚ دەکەنەوە
من ئاسمان بووم بۆ مانگی عیشقی تۆ
کەچی شوێن کاروانی ئەستێرە کشاوەکان کەوتی
چاوە سیحراوییەکانت
ورشەی ئاڵتونیترین ئەستێرەیان تیابوو
من نازانم زەمەنی خامۆشی بووە میوانت
یان تەوقی زێڕین خامۆشی کردی
بڕوام نەبوو نامیهرەبان بیت
چونکە وانەی زەردەخەنە لەنیگاکانتەوە فێردەبووم
هاوهەناسەت بووم ئەو دەمانەی
تۆ واتدەزانی بەشی سنگێک هەوا نەماوە
هاوساتت بووم ئەو دەمانەی
تۆ واتدەزانی زەمەن گەیشتووە بە کۆتایی
تۆ دەتتوت کەسێکم ناویٚ عاشق بێت
کەسێکم ئەوێت وەك تۆ نەبێت
هەموو کەسێکت ویست و منت نەویست
بیرتە ڕۆژانی سەرەتای ئاشنایەتی

من سوژدەی نیگام روو لەقیبلەی چاوانت بوو
ئای لەم جوداییە تاڵە
لەمەرگی لەسەر خۆ دەچێت
هەرچیم خۆش ویستووە پێشتر ئێستا قینم لێیەتی
بتتەوێ یا...نا...برۆ خوات لەگەڵ
عیشقەکەمان بالاگەردانی جوانیت بێت و
منیش بالاگەردانی عیشقەکەمان
تۆ تەفسیرێکت نەبوو بۆ سەفەر
هەر دەزانی کەشکۆڵەکەت هەڵگری
نازانیت چ سەرەتایەکە و
لەکوێیە کۆتایی
تۆ باخچەیەک بووی لەگوڵاڵە سوورە و
ئاسمانێک بووی پڕ ئەستێرە
بەشی هەموو عاشقەکان گوڵی دیاریت پێبوو
بەشی هەموو جیهان ئەستێرەت لەئامێزبوو بۆ کێشان
هەمووان لەتۆوە چرۆی عیشقیان دەکرد و
هەمووان لەئامێزی تۆوە مەرگیان بۆ دەهات
منیش حەزم زۆر بوو
زۆر ... هێندەی ژمارەی نیگاکانم بۆ تۆ
بەڵام دوایین حەزم ئەوەیە
بزانم دوایین بەهانەت بۆ کوشتنم چیە ..



لەسەر خۆ دەمرم لەدەردی ئەم فیراقە
هەر وەکو چۆن لەسەرخۆ دەژیام
لەچاوەڕوانی پشکووتنی گوڵی عیشقم
دەمکوژێت و نازانم بۆ
دەمرم و نازانم بۆ
تۆ سایەی ئاسوودەیی عیشق بووی بۆ من
چۆن دەبێت لەم سەحرای ژینەدا
بێ مەئوا وێڵی دوای سەرابەکانی روخسارتم بکەی
چۆن دەبێت کۆشکی خەونەکانم
شێتگیرانە بەسەرمدا خاپور بکەی
ئاخر... بۆ نازانی بەم پایزی سەفەرەت
باخچەی حەزم گوڵی نیگاکانی دەوەرێ
چ مسافیرێکی خەم بەخشی
دڵم دەیەوێت پێت بڵێت:
(ئیدی نە سۆزت ماوەو
نە عیشقت زانی)
جیهانێک شیعرم بۆ نووسیت
تۆش نەتوانی دڵێکی ئاسمانی بیت و
ئەم ئەستێرە دۆڕاوە جێبکەیتەوە لەگۆشەیەکترا
نەتوانی لەباخچەکانی ویستمدا
وەکو هەنگێک

بەماچ هەلاڵەی عومرێک شیعر و...حەزم لێ وەربگری
ئێستا دەریای ئارەزووم پڕ بووە لەشەپۆلی مەرگ
پێدەچێ ڕۆژێک
حەزی فەنابوون لەکەنارم لەنگەر بگرێت
چ کارەساتێکە هەناسەم بێ و بچێ و
چاوەکانم بەرببنەوە ..
پەنجەکانم هەڵوەرن ..
پاڕانەوەیەکم نەماوە لەتۆ
کە جاران داوام دەکرد وەدەرم نێی لەئازار
تەنها دەڵێم: بریا دەبووی بەباران
ئەوکات دەتبینی جەستەم چۆن تامەزرۆتە
هەموو ڕۆژێک ئینجیلی عیشقت دەخوێنمەوە و
هیچ ئایەتێکت نەناردووە لەسەر بێوەفایی
تەنانەت پەیکەرەکەشت بەمیهرەوە تەماشام دەکات
ئەگەر فەرزی ژیانە بێوەفایی
ئەمجارەیش ئینجیلەکەت بنووسەوە و پێم بڵێ..!
بۆ ئەوەی هیچ خاچێک لێم زوویر نەبێت
جیهانم قەرزاری وشە کرد
کە هەموویانم لەپەراوێزی تۆدا جێ کردەوە بەشیعر
شیعریشم ڕووزەردی لای شاعیران بوو
کە بۆ میهرەبانێکی دڵبەردم نووسی



ئارەزووی ژیانێکم دەکرد
کە لەڕەنگی چاوت بچێت
بۆ ئەوەی جیهان ڕەنگاڵە ببینم
تەمەنای مردنێک دەکەم
کە لەڕەنگی پرچەکەت بچێت
بۆ ئەوەی کە باران باری بەسەر سەرتەوە بم

**٢٠٠٤/٣/٤**

# دەمەوێ پەست بم



دەمەوێ پەست بم بۆئەوەی عیشقم بیرچێتەوە
دەمەوێ بگریم تا کورپەی گریاوی عیشق ژیربێتەوە
چ شێتیەکە هاوڕێ
وادەزانی شیعر برینی خۆشەویستی سارێژ دەکا
تۆ بیری خۆتت بردووەتەوە
کە حەبیبەکەت پێی ووتی من تەنها شیعرم خۆش ناوێ
دەی من چی بکەم کە لەشیعر زیاتر هیچ شك نابەم پێشکەشی کەم
تۆ درەختێك بووی زەرد
شیعری سەوزت بۆ ئەو دەگرت
دەریایەك بووی مەنگ
شەپۆلی مەرگت دەدا بۆ کەناری ..
هاوڕێ ئەو ئیدی گوێ بۆ ئاوازەکانی تۆ شل ناکات
ئیدی نایەوێ بەوێنەی تۆ ئەلبوومەکەی خەڵتانی گریان بکات

نایەوێ من و تۆ

موناجاتی ئەم خەڵوەتە بگەیەنینە کۆتایی

ئەڵقەی ئەم زیکرەمان بەرلە شێوان لێ دەشێوێنێ

تەهلیلەی سرووتی ماچ و دانیشتن بۆ روانین لەغروب

لەگەڕومانردا دەتاسێنێ

تۆ دەمریت و منیش لەچاوەڕوانی مەرگدا

حەیرانێک بۆ دۆڕانی خۆمان دەچڕم

من دەمرم و تۆش بە دۆڕانی هەردووکمان پێدەکەنی

نە تۆ... نە من نامرین و

هەموو عیشقنەزانەکان پێمان پێدەکەنن

نە من... نە تۆ ناژێینەوەو

درۆی سەرکەوتن بەگوێی خەڵکا دەڵێینەوە

هاورێ... لێگەڕێ با هەموو دونیا

رەنگی تەریق بوونەوەمان بگرێ

لێگەڕێ با وێنەکەی یار ببینن لەچاوماندا چۆن تەلاّییتر دەبێت رۆژ بە رۆژ

کامێرایەک بێنە... سیناریۆکە وا گەیشت بەکۆتایی

مەپرسە کێ لەو دیو کامێراوە پێمان دەڵێ: (ئەکشن)

بڕوانە لەئاوێنەکەت بزانە چەند جار لێت گۆڕا

بۆنت لەودا لەبری خۆت

٢٠٠٤/٢/١١

# وانەی یەکەمی عیشق



ڕاستە .. !!
هەرچی دەڵێن و وتیان وابوو
بیرم نەماوە کێ لەوان بوو
هێندەم بیرە
وتیان:"شیعر شاعیر شێت دەکات و
عیشق عاشق عیبرەت دەکات"
لە نیگای پەپولەیەکەوە
سەمای ئەو نیلۆفەرانەم دیت
کە مەرامیان بوو بە ڕەنگەکانیان
لەگەڵ وردە شەپۆلی ئاوە هێمنەکەدا
تابلۆیەکی شێتانە دروست بکەن
ئەمشەو پێرەچێ فشارێک لە نەستمەوە

ئیعتیرافاتی تاوانکارانەم پێ بخاتە سەر پەڕە
دانی پیا دەنێم وێنەکان لە چاوی مندا دەشێوێن
ئێوە ئاسمانی پڕ ستارەو و مانگێک دەبینن لەشەودا
من تەنها تاوانەکان و مەعشوقێکی تیا دەبینم
من چەند سەر شەوێکە لە ئاسماندا
ڕێگایەکم بەدی کردووەو
پیایدا دەڕۆم
ڕێگایەک بە کاروانسەرای فەشەلدا دەگوزەرێ و
بە تەنیشت دڵبەردی
مەعشوقە نەزانەکاندا درێژ دەبێتەوە ..
هەموو شەوێک کە ئەو ڕێگایەم لێ وون دەبێت
دوکەڵی جگەرە ڕێنموییم دەکات ..
بۆ ئەوەی هەمیشە لێم دیار بێت
جگەرەکانم یەک لە دوای یەک پێدەکەم
هەموو ڕۆژێ لە دادگای هەستمدا
سکاڵایەکی نوێی سەراب دەبینم و
بە حوکمی تا هەتایی لە تەنیایی خۆمدا مەحکوم دەکرێم
بەر لەوەی بەرامەی یەکەمین گوڵ بگاتە سییەکانم
ئەو کاغەزانەم دەجوی
کە خوشکە گەورەکەم
وێنەی گوڵی تیا دەکێشا بۆم ..



ئەو دەمانە گوڵ زۆر جوان بوو
ئاخر خۆ ئێوەش دەزانن
گوڵە کێشراوەکان گەر من نەمژاکاندایە
پایزە کۆچیان نەبوو
لاو لاوەکان دەیانویست
بە تاڵە بەنەکاندا هەڵزنێن بۆ بەرزترین
من چرۆکانیم دەقرتاند
دەمگوت بۆ باڵای ئەوان
لە باڵای من بەرزتر بێت
خەمی باڵا بەرزەکان
باڵای خەمی منیان بەرز کرد
ئای لەبەرزی باڵای خەم و
لە عەدەمیەتی هۆش لە لای من
بیابانێک وانەی خۆشەویستی ئاوی فێر کردم و
دەریایەک حیکمەتی شەپۆلی
وەک ئەڵقە کردە گوێم ..
ئەڵقە لە گوێیەکان
وەک من لە حیکمەتی ژیان تێدەگەن
تەفسیرێکم نیە بۆ خۆم و
هەموو شەوێ
دەیان موحازەرەی عیشق دەڵێمەوە بۆ خۆم و

لە من چووەکان و

دەڵێم:

وانەی یەکەم: "عیشق لە ئاسمانەوە دێ بۆ مرۆڤەکان و

لەگەڵ خۆیدا دەمانبات بۆ ئاسمان"

٢٠٠٤/١/١٥

# ڕەنگەکان تاڵان دەکەم



وەکو ڕۆژانی ڕابردوو
لەگەڵ خۆمدا
بیر لەدوێنێ درۆزنەکان دەکەمەوە
بیر لەبێ ڕەنگی بەهارە سەرسەرییەکان دەکەمەوە
لەئاسمان ڕاماوم و
نەفرەت لە ڕەشەبا دەکەم
کە نایات و ڕامانماڵێت ..
تف لەنەسیمەکانی بەربەیان دەکەم
کە وەک جاران
بێشەرمانە ماچێکی وشکمان دەکەن و
وون دەبن
شەق لەپێکە گومڕاکان هەڵدەدەم و

مەستی لەچاوی خۆمدا دەبینمەوە
دەڕۆمەوە نزیک باخچەی ساوایان و
بۆ منداڵی دەگریم
بۆ ئەو زەمەنەی وەکو مەرگ ئاوێزانی بووم
نەعرەتەی قین بەسەر زەمیندا دەبارێنم
دەکەومە هەنسکێکی قوڵ
دەترسم لەمردن
دەترسم لەژیان
ترس لەنائاگایی بوون خەریکە دەمباتەوە
بەرەو نەبوون
بۆنی شێتی دەکەم لەهەموو جەستەم
شێتبوون لەبازنەی کەللەمدا تابلۆیەکی بێکەسە
نەفرەت لەپەنجەکانم دەکەم
تا هەنووکە نازانن دوگمەیەک بترازێنن
نەفرەت لەلێوەکانم دەکەم
شێتانە ماچ شاباشی دڵتەنگیم دەکەن
دەڕوانم لەخۆرئاوا و
خەیاڵ دەمباتەوە حزوری
بێ دەسەڵاتی خۆم
دەگەمەوە
یەکەمین ئاوازی تارە ڕەدووکەوتووەکەی حەزم



ئالبوومی یەکەمین کفرم
لە دوایین تەوبەی ئێوارەیەکدا دەسووتێنم
تەوبە دەکەم لەژیان
بەڵێن بە مەرگێکی نارنجی دەدەم
ڕدێنم دەکەمە تاڵە دەزووی کۆلارەی پاکبوونەوە
دەبم بەزاهیدێکی خاڵی لەحەز
بۆ تەهارەتی ڕۆحم
سوورەتێک لەواهیمەی بوون خەتم دەکەم
خەڵوەتی گەمژەبوون دەکێشم
تا بێ ئاگا لەکشانی ئەستێرەکان شەوم ڕۆژ بکەمەوە
تا بێ موبالات بم لەهەڵاتنی ئەو خۆرەی
تەنها پەیامی ئەدا کردنی سرووتەکانە ..
لەخۆمدا تەهلیلەی ئەو یەقینە دەڵێمەوە
کە من هێشتا نەهاتوومەتە بوونەوە
بازنەیەکی بچووک دەکێشم و
هەزاران دەف شەهید دەکەم
دەڕۆم و بێ ئاگا لەگەورەیی بوون
تەسبیحاتی ئەم پاکبوونەوەیە
بە دەنگە شاخەکانی ئەم هەرێمە لەقورگیراوە دەکەم
فەتوای شەرێکی بێ دەنگ
لەبڵندگۆی مزگەوتەکانەوە بۆ هەموو جیهان دەدەم

بەماتماتیکی عیشق خۆم دابەش دەکەم
تا دەکەمە ئالأیەک و
دوو هەرێم و
چوار کورپەی تاساوی یەک نیشتمان
دەبمەوە بەو زارۆکە لاسارەی
هەموو سپێدەیەک
بەشی هەموو دونیا دەگرێ
هەموو شەوێک
بەشی هەموو مرۆڤەکان پێدەکەنێ ..
دڵم دەکەمە ئەو چوار چێوەیەوە
کە وێنەی ئەسپێکی بریندارى تیایە
چاوم دەکەمە خۆری ئەو ئالأیەی
کە هێمای نەتەوەیەکی
مەحکومە لە مرۆڤ بوون
هەموو ڕەنگەکان بۆ خۆم تالأن دەکەم
ئاوەزی ڕەش و سپی دەبەشمەوە
لەدەمی کانیەکی ماچکراودا
ئەو هەناسانە دەماڵم
بەشی دوو دەیە شەڕیان هەڵگرتووە
ئەو خاچانە لەخۆم دەدەم
کە پەیامی دڕۆیان پێیە بۆمان



جارێکی دیکەش دەڵێم:
(خوایە من چی لەوەتەن بکەم با هەر ئاوابێ
با هەر دڵگیر و شیرین بێ
با هەر خاکی وەکو گەوهەر بێ
با هەر ئاوی وەکو کەوسەر بێ
کە نەتوانم بەهاران ڕێگای ماڵی گوڵ
بەپەپولە ئاشنا بکەم
کە نەتوانم ئەدرەسی ئاشتی
بدەمە کوترێکی سپی
کە نەتوانم بەپاچی حەزی کورپەی شەهیدێک
ئەم درەختی شەڕە لەڕەگەوە دەربهێنم
ئەم تاعونی نیفاقە لەفەرهەنگی مرۆڤەکان بسووتێنم)

٢٠٠٤/٩/١

*ئەو (١١) دێڕەی ناو کەوانەکە لەقەسیدەی(مەرسیلیاکانی مەرگ)ەوە وەرگیراوە.

# وەرە پێکەوە ئاوابین



دەڕۆیت و نالێی ماڵئاوا
دەڕۆیت و
چەپکێ گوڵ ناهێنی بۆ سەر گۆڕی گومناوی عیشقمان
ناهێڵی کەسێ فرمێسکە خنکێنراوەکانم
بەتاڵەکانی پرچەکەتەوە ببینێ
ناهێڵی دواپین
شیعری بریندارت بۆ بخوێنمەوە
بێ هیوا
جێمدەهێڵی لەژێر داروپەردووی
کۆشکی خاپوری خۆشەویستیدا
بێ هیوا
نیگاکانم دەدەیتە شاباڵەکانی نەورەسێکی تۆراو ..

بهێڵە

بۆ دواجار تابلۆی ماچە فێڵاویەکانت پێشاندەمەوە

بهێڵە

جارێکی دیکەش خۆم وونکەم لەدەریای پرچی داپۆشراوتا

ئەمێستا من

سەرگەردانێکم دڵشکاو

ئاوێنەیەکم تۆز لێ نیشتوو

عاشقێکم ...عیشقنەزان

ریسوای گێژاوی شەپۆلەکانی قەدەرم ..

شێتێکم ماڵوێران

کۆلارەی دەستی منداڵێکی لاسارم ..

پەیکەرێکم

هەمیشە ئەشك بۆ بەبەردبوونی دڵم رۆدەکەم ..

درەختێکم

پایزبێ یا بەهار من هەر گەڵا رێزانمە ..

گوڵێکم پەژموردە

رۆژباشەکانی تۆ نەبێت

بەئاوی هەموو ئۆقیانووسەکان سەوز نابمەوە ..

مۆمێکم بێ گڕ

لەحەسرەتی جواییدا دەتوێمەوە ..

دەبهێڵە وون بم لەتۆدا



وون بم لەتۆدا و ژیان بدۆزمەوە

تۆم هەبی من هیچ وەرزێکم ناوێ

ساڵژمێرم لەخۆشەویستی تۆوە دەست پێدەکات و

لە جودایی تۆ کۆتایی دێت

هەفتەی من بێ هەینی و بێ شەممەیە

(یەك عیشق و دوو نامە و سێ ماچ و

چوار زیزبوون و پێنج مەرگ)ە

رۆژی من بیست و چوار ئازارە

دەققەی من شەست فرمێسکە

چرکەی من هەزار خەمە

دەبهێڵە بە خونچەی حەزەکانم

ناخت بکەمەوە بە گوڵستان

بهێڵە جارێکی دی شانۆیی دۆڕانی خۆمت

لەسەر تەختەی نامەیەکی دڵتەنگدا بۆ نمایشکەم

بهێڵە ناسنامەی عیشقت نیشان بدەم

بۆ مەحکومم دەکەی بە(خەم)

وەرەو

ئەم تەوقی مەرگە بشکێنە لەدەست و پێم

ئەم تراویلکەی ماچە بکە بەدەریایەك تیایدا مەلە بکەین

خەزان بهێنە بۆ ئەم باخچەی (ژان)ەم

بمبینە

چۆن لەکونێی ژوورە چۆڵەکەمدا خۆم لێ وونبووە ..
بۆ ناهێڵی
وەکو جاران خۆم و پێنووس و پەڕە بدۆزمەوە
تا قەسیدەیەکی دیکەش بۆ جاویدانی عیشق بنووسم
بوێڵە
چاوەکانم رۆمانێکی نوێت بۆ بنووسن بە نیگا
نامەیەکی خاڵی لەوشەم بۆ بنێرە
باجیهان پڕ بکەم لە وشەی نەوتراو
رێبرە مانگێکی دی هەڵبێت
تا سەران خەرمانەی لەسەما بۆ برەم بەرەوریدا
رێبرە
جارێکی دی خامە کۆڵەکەم
قەسیدەیەک بۆ سروشت بنووسێت
رێبرە هەناسەیەکی دی هەڵمژم
کە هەموو جیهان بۆنی هەناسەی تۆی لێدێ
شەوێک وەرەو
لەبەر بارانی ئەم عیشقە چیاییەم
خۆت تەڕ بکە بە رەهێڵەی نامە ئاوییەکانم
رۆژێک وەرەو
مۆڵەتی خۆر بدە پشوو بدات لەم مەملەکەتە
بۆ کوێ دەچی



تۆ نازانی لەوێندەر منی لێ مردووم
نازانی تۆی پەری
پێویستت بەدڵێکی ئاسمانییە بۆ فڕینەکانت
وەرەو تاراکەت فڕێدە
با حەیرانێک بۆ یاخی بوون بچڕین
یاخی بوونی پەنجە لەباخی سینە
یاخی بوونی ماچ لەپێرەشتی لێوان
یاخی بوونی نیگا لەدەریای چاو
یاخی بوونێکی ... یاخی
وەرەو
تا عیشق سەفەری نەکردووە
پێکەوە لەئاسۆی وەفاوە هەڵبێین
پێکەوە لەناوەڕاستی پەیماندا چەق ببەستین
پێکەوە لە ئێوارەی عیشقدا ئاوابین
دەوەرە ...وەرە باپێکەوە ئاوابین

٢٠٠٤/٤/٣٠

# تەوبە



تەوبە دەکەم لە عیشق .. لە خۆشەویستی
تەوبە دەکەم لە پیاسەی ئێوارانی
ناو گەڵا زەردە وەریوەکان
لە ئەفیون بە جوانتی شۆخێک
لە روانینی سیمای سیحراوی
دەچمە بەردەم پەنجەرەیەک و
دوو قوم لە جگەرەکەم دەدەم ..
لە پارچە ئاوێنەیەکی شکاوەوە
دەڕوانمە بەشێکی ناشیرینی خۆم
تەوبە دەکەم لە عیبادەت ..
قیبلەنماکەم دەشارمەوە ..
روو دەکەم لە ئاسمان و نوێژ دەکەم
ئیدی بە پرچی هیچ کچێک یاری ناکەم
ساتەکانی دەستگوشین و ماچ بیری خۆم دەبەمەوە

ئیدی ئامەزرۆی تێکئاڵانی جەستە نابم
دەچمە ژێر بارانێکی پاییزی و
خۆم پاک دەکەمەوە لە گوناهەکانی عیشق
تەوبە دەکەم لە عیشقی درۆ
سوژدەی ئیستیغفار دەبەم
رۆحم یاخی دەکەم لە جەستەم و
دەبمە چاوی کەنارییەکانی دیل
دیلی قەفەسە ژەنگرتووەکانی ژیان ..
دیلی هەناسە چڵکنەکانی ئێرە ..
ئارەزووی فڕین دەکەم
فڕین بەرەو عەدەم
عەدەمی بەر لە هاتن
دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ پێش لەدایک بوون
تا لەوێوە نەفرەت لە ژیان بکەم
لە نەبوونێکی هەرمانەوە
گاڵتە بە ژیانێکی ئاوها قەشمەر بکەم
تەوبە دەکەم لە گەمژەیی ..
لە گەورەیی ..
لە پیاو بوون ..
دەبمە بەردی سەر شەقامێک
کە بەدەم شەقی ڕێبوارەکانەوە هەڵەکە سەمایەتی



دەبمە گوڵێکی بێ بۆنی ناو ئینجانە کۆنەکان و
چاوەڕێ ناکەم کەسێ بۆنم بکات
چاوەڕێ ناکەم کەسێ ئاوم بدات
چاوەڕێ دەکەم خوا لێم خۆش بێت
کە لە عیبادەتیشدا کچم خۆش دەویست
چاوەڕێ دەکەم کچ لێم خۆش بێت
کە لە خۆشەویستیشدا قینم لێیان بوو
چاوەڕێ دەکەم دایکم لێم خۆش بێت
کە نەگریام بۆ مردنی
چاوەڕێ دەکەم باوکم لێم خۆش بێت
کە پێناکەنم بە بوونی ئەو
چاوەڕێم .. چاوەڕێی لێخۆش بوونمە
تەوبە دەکەم لەمزگەوت و کڵێسا ..
تەوبە دەکەم لە هەموو کتێبەکان
تەوبە دەکەم لە مرۆڤ بوون
دەچمە سەر پشتی نەسیمێک و
هەموو جێیەک دەگەڕێم
دەگەڕێم بۆ ئەوەی کە نازانم چیە
رۆحم تێکەڵی خوڕەی کانیەک دەکەم
کە ئەو هاتووەتە رۆحمەوە ..
چاو دەدەمە وردە زیخەکانی ژێری

کە چیدی نامەوێ شتی دیکەی پێ ببینم
ئای کە تا ئێستا ناهۆشیارم
خۆ نازانم من و خۆم لەیەک ئاشت بکەمەوە
نازانم چۆن لەگەڵ خۆم بدوێم و
نازانم چۆن من بناسم
تەوبە دەکەم .. تەوبە

٢٠٠٤/١١/١٧






خولیای یەک جار بینینەوەم
یەک سڵاوی دیکە ..
خولیام .. خولیای گەمەیەکی دیکەم
خەوێکی دیکە ..
تامەزرۆم ڕۆژێکی دی لەژێر بارانا بتبینمەوە
پڕم لە حەزی بیستنی تریقانەوەیەکی دیکەت
خەمم لێدەڕژێ و فرمێسک
حەزم لێدەبارێ و ماچ
پەڕەمووچێکم هەڵگرتووەو
تابلۆی ئەو ماچانە دەکێشم
کە لە هەوادا بۆت دەناردم
کامێرایەکەم بە دەستەوەیەو

وێنەی هەموو ئەو دیمەنانە دەگرم
کە ڕۆژێک ناویان لە لێوی تۆوە دەرهاتووە ..
ئەو دەمانەی تۆم هەبووی
نە خەون .. نە خەیاڵی بە تۆ گەیشتنم نەبوو
دەترسام خۆری عیشقمان ئاوا بێت
من نەمزانیبوو کەژاوەی بووکێنی تۆ
لە مێژە کەوتووەتە ڕێ و
تاراکەت بووە بە دەسەسڕی سەر چۆپی

٢٠٠٤/١١/١٣

# لەگەڵ تۆدا ئەی با



لەگەڵ تۆدا ئەی با
دەمەوێ بەناو ئەلبومی گریانەکانی باراندا بگەڕێم
چونکە گەواڵەیەک خەمم لێ وون بووە ..
لەگەڵ تۆدا ئەی مانگ
دەمەوێ حیکایەتی ڕێی ئەستێرە کشاوەکان بخوێنمەوە
چونکە ئەستێرەیەکی لای بەیانیانم لێ وون بووە ..
خەمێک ئاویلکەی لە نەشئە دەچوو ..
ئەستێرەیەک ورشەی لە پزیسکی دۆزەخ دەچوو ..
لەگەڵ تۆدا ئەی شیعر
دێمە لە دەرگای دڵە بەربەرییەکان دەدەم
چونکە بە منداڵی دەرگای هەموو مەرقەدەکانم کوتاو
نەبووم بە عیرفانێکی هەڵوەدای سیمای خودا ..

لەگەڵ ئێوەدا ئەی ڕوئیا فاشیلەکان
دەمەوێ پێکێک بنۆشم کە خەیام بۆنیشی نەکردبێ
چونکە من گەر بەدەمەست نەبم
ڕەنگە ئەم تەقوایەم بۆ تەواو نەکرێت ..
کتێبێک دەگرمە دەستمەوەو
هیچ دێڕێک .. ووشەیەک .. پیتێکی تیا نیە ..
کتێبێک من نووسیومەتەوەو دەینووسمەوەو
هیچی تیا نیە .. هەر نەخشەی عیشقێکی دۆڕاو نەبێ ..
چوار دەورم دەرگایەو هیچیان ناکرێنەوە
هیچیان دانەخراون .. هیچیان کلۆم نادرێن
هیچیان دەرگا نین ..
ژوورەکەم هەمووی پەنجەرەیەو کەسی لێوە نابینم
نامەوێ کەسی لێوە ببینم ..
پەنجەکانم وەکو جاران نازانن پێنووس بگرن و
پەڕە سنگ ڕووتەکان ڕەشکەنەوە ..
وەکو جاران بۆنی پایز نایاتە هەناسەمەوە ..
وەکو ئێستا مەست نابم ..
دیوارێک نەما خەیاڵی ژوانێکی لێنەکەم ..
بەردێک نەما هەوەسی ڕامووسانێکی لێنەکەم ..
شەوێک نەما
باسی پرچە پەرێشانەکەی ئەو شۆخە بەدخوەی بۆ نەکەم ..



لەگەڵ تۆدا ئەی کچ
ئەی سەرشێت بە بۆنی ئەهریمەن ..
ئەی شکاو وەکو چڵی لاولاوێکی تازە ..
ئەی بێفەڕ وەکو زەرفی نامەیەکی بە تاڵ ..
دەمەوێ دانیشین حەیرانی گەمژەیی تۆو
فەشلی خۆم بۆ ئێوارەیەکی خەمناک بچڕین ..
لەگەڵ تۆدا ئەی کوڕ
ئەی سەرشێت بە عیشقی کچێکی نەفام ..
ئەی زبر وەکو دەستەکانی باوکێکی دڵڕەق ..
ئەی بێفەڕ وەکو دێڕی ئەو نامەیەی کە نایزانی بینووسی
دەمەوێ لەگەڵ تۆدا دانیشین ئێوارەیەک تا نیوەشەو
یەک .. یەک پێکەکانمان بە خۆشی خەمەوە لە یەک بدەین
من بەیانیەک دەبمە کوڕە گەدایەک و
دەست لە ئاسمان پان دەکەمەوە
تا ملی ئەسپەکانت بەرەو لای من وەرگەڕێن ..
ئێوارەیەک خەیاڵم دەکەمە پیاوێکی تەواو و
بە شەهوەتی پێنووسەکەم
سکی هەموو پەڕە حەشەرییەکان پڕ دەکەم
لە قەسیدەی مەکرباز و
لە فێڵی تازەی ناو جانتا کۆنەکەم و
لە دێڕی دزراوی ناو لیفیکسەکەی ماڵەوە ..

ئەو ئاگای لە من و تۆو هەمووشمانە ..
ئاگای لە بێئاگاکانیشە ..
لە دارو بەرد و ئاو و ئاگر و دێڕی ناو هەموو شیعرەکانیشە ..
ئەو دەپرستم و تۆ دەشکێنم ..
ئەوم خۆش دەوێ و نەفرەت لە تۆ دەکەم ..
تۆ کە رۆژێک ماکیاژەکەت کاڵبووەوە
خۆتم لێرەشاریتەوە نەبا جوانی لێوت دەرکەوێ ..
ئەو وەکو من نەفرەت لە ماکیاژەکەت دەکات ..
شەوی یەک نامە دەنووسم بۆ ئەو
دە بۆ تۆ ..
شەوی هەزار جار ئەو دێتە خەیاڵم
دە جار تۆ ..
ئەو خودای منەو
تۆ بەندەی دڵێکی شێت و شێواوی ..
لەگەڵ تۆدا ئەی خۆم
دەمەوێ وانەیەکی نوێ بخوێنم
چونکە لە مێژە هەموو پەڕاوەکانم وون کردوە ..
لەگەڵ تۆدا ئەی تۆ ..
دەمەوێ تەهلیلەی عیشقێکی پێژوو بڵێینەوە
تا ئەم میحرابی بێهۆشیە پڕ نەبووە
لە ماچی پێژوو .. تێکئالآنی پێژوو .. سەمای پێژوو



شاعیری پێژوو .. کچی پێژوو ..
من مەمکی دەریا دەبینم .. فەریکەو
تەنها بەشی ژەمێ مەرگی تیایە ..
لێوی شەپۆل هەر تەڕەو
قەتماغەی خوێنی کوڕە سیاچارەکان دەدا لە لێوی ..
تۆ سور دەپۆشی لەژێر ئالآی دۆڕاوی نیشتمان و
من دەگریم لەژێر سێبەری ناوی شەهید ..
من کوڕێکی شێت و نەداری ئەم هەرێمەم ..
رۆژ نیە نەگریم بۆ شەهیدەکان و
رۆژ نیە خۆشم بە شەهیدی نەبینم ..
من و شەهید هەردوکمان شەهیدین ..
من دەمی جەنگ بالآم هێندەی بالآی
چەکەکەی شانی شەهید بوو ..
"شەهید بالآی بە قەد بالآی کوردستان "..
خوێنم هێندەی دڵۆپێک خوێنی شەهید بوو ..
شەهید بە قەد ئاوی هەموو روبارەکان ..
شەهید لەڕێی خاکا خۆی بەخت کرد ..
من لەنێو لاپەڕەی شیعرێکدا شەهید دەبم
کە ناوی تۆی تیا نەبێت .. ئەی تۆ
ئەی ئەوەی گوێت لە هەموو حەرفێکمە و هیچ نابیستی ..
ئەی ئەوەی من دەبینی و نابینایت ..

ئەی وونبوو .. وەکو شیعرێکی دزراوی من ..
وەکو دایکی منداڵێکی من ..
وەکو ماچێکی پڕ لە تاسەی بەر لەسەفەر ..
وەکو یادگاری شەوێکی ناو ئۆتێلی ولاتێکی وون ..
وەرەو گەشتێك بکە بەرەو ئاسمان
منیش ببە بۆ لای ئەستێرەکان
با پێکەوە
گوێ لە چیرۆکی درۆی لەیل و مەجنون بگرین و
پەلی هەردوکیان بگرین بۆ لای یەك ..
با ڕێنەدەین چیدی ئەستێرە بە ناحەق بکشێ ..
با نەهێڵین .. چرای هیچ ماڵێك بکوژێتەوە ..
دە وەرە .. بۆ هێندە خولیای زیز بوونیت لە خۆڕا ..
من تەئویلی ئنجیلت بۆ ناکەم ..
بۆ پەنجەت ئاخنیوەتە گوێیەکانت ..
بۆ بێزاری لە وانەی ڕەهای بێمانایی ژیان
بۆ باوەڕ دەهێنی بە درۆی ئاوێنەی ناو ژوورەکەت و
وا دەزانی ژیان خەوێك و هیچی دی ..
وا دەزانی عیشق ماچێکەو هیچی دی ..
وا دەزانی خەم مەرگێکەو هیچی دی ..
تۆ شەو نیە خۆت پارچە پارچە نەکەیت بۆ من
من ڕۆژ نیە نەگریم بۆ نەفامی تۆ



تۆ ڕۆژ نیە نامە نەنێری بۆ من
من شەو نیە پێنەکەنم بە تۆ
تۆ شێتترین کچی شاری عاشقانی ە
من گەمژەترین کوڕی ناو هۆڵێکی پڕ جوڵە ..
شایەدمان بهێنە بە درۆی عیشق و
بەر لە نووستن بیخوێنە هەموو شەوێ
ڕەنگە بەیانیەك کە هەستای خودات لێخۆش بێت
ئەی تۆ .. ئەی تۆ .. ئەی تۆ

٢٠٠٥/٢/١٧

# پێڕست

| ناوی شیعر | ژمارەی لاپەڕە |
|---|---|




| ناوی شیعر | ژمارەی لاپەڕە |
|---|---|